جوان، باوك جوان، برا جوان، خوشك جوان،...). بەهەمان شێواز، دەشێت رووبکەین لە هەزاران نموونەو راستەوخۆ بیانخەینە بەر نووکی پێنووس. لەڕووی میکانیزمەوە، دەتوانین بڵێین، ئاوەڵناو، لە جەمسەری سەرەوە، خانەیەکی بۆش هەڵدەگرێت و نووسەرو ئاخێوەریش سەر پشکن بۆ پڕکردنەوەی ئەو خانە بۆشە بەهەر (ناو)ێکی بەجێ. بێگومان، لە پاش چەسپاندنی (میکانیزمی تەرخانکردن) ئاوەڵناوەکە لە باری گشتییەوە وەك (جوان) وەردەچەرخێت بۆ ئاوەڵناوێکی تایبەتی و دیاریکراو وەك (کراس جوان). لەگەڵ ئەوەشدا، واتای ئاوەڵناوەکە دەگوێزرێتەوە بۆ سەر کەسێك یان تشتێك کە خاوەنی ئەو ئاوەڵناوە تەرخانکراوە بێت، نەك بەخودی خۆی ئاکاری ئەو ئاوەڵناوەی تێدا بێت. بۆ نموونە، ئاوەڵناوی (بالا جوان) واتای (خاوەن بالای جوان) دەبەخشێت. یان (کردەوە جوان) واتای (خاوەن کردەوەی جوان) دەبەخشێت. لەگەڵ ئەمەشدا, ئەم گەمەیە لە ئاستی هەر ئاوەڵناوێکدا واز دەکاتەوەو ئاوەڵناوەکەش لە ئاستی هەر ناوێکدا بۆی هەیە هەڵوەستەیەك بکات.

## ٣-٣ ـ ئاکاری ناسراوی:

لەزمانی کوردیدا ئامرازی ناسراوی (ەکە) بریتیە لە ئامرازێکی تایبەتی بۆ ناساندنی (ناو) وەك:

دار: دارەکە

باخ: باخەکە

مێز: مێزەکە

بێگومان، زۆرجاریش دەبینیت کە ڕێزمانەکە ڕێ دەدات ئامرازی ناساندن (ەکە) بلکێت بە ئاوەڵناوەوە, وەك:

جوان: جوانەکە, بەرز: بەرزەکە, سوور: سوورەکە

لە ئاستی جۆرە نموونەی ئاوهادا، نابێت چاو بلەخشێت و وا تێ بگەین کە ئامرازی (ەکە) نووساوە بە (ئاوەڵناو)ەوە، چونکە لە ئاستی هەر نموونەیەکدا لە چەشنی ئەوانەی سەرەوە، ناوێکی کرتاو هەیە، وەك:

جوانەکە: (کچ)ـە جوانەکە
مێزەکە: (مێز)ە بەرزەکە
سوورەکە: (کراسـ)ـە سوورەکە

لە ڕاستیدا، ڕێزمانەکە ڕێ دەدات کە ناوەکە بکرتێت و ئاوەڵناوەکەش ئامرازەکەی بۆ بپارێزێت، وەك:

کچەکە: کچە جوانەکە: جوانەکە
مێزەکە: مێزە بەرزەکە: بەرزەکە
کراسەکە: کراسە سوورەکە: سوورەکە

بەسەرنجێکی ورد و ژیرانە لە نموونەی سێیەم، بە ئاشکرا دیارە ئامرازی (ەکە) چووەتە سەر ناوی (کراسەکە) و پاشان ئاوەڵناوی وەرگرتووە و بووە بە (کراسە سوورەکە) و لە پاشتردا ناوی (کراس) کرتاوەو بووە بە (سوورەکە). بە واتایەکی دی، لەهەر جێیەکدا کە ئامرازی (ەکە) لەگەڵ ئاوەڵناودا دەرکەوت، ئەوا بە (بێگار) هەڵی گرتووەو هی خۆی نیە و هی ئەو (ناو)ەیە کە بە ڕێزمان لاچووە و لەبەرچاو نەماوە, بەڵام خانەکەی ماوە لە نێو بیردا, وەك (کراسـ|ـــ|ـەکە).

### ٣- ٤ ـ ئاکاری بەستن بە ئامرازی (ـە):

ئامرازی بەستن (ی) بریتیە لە ئەو ئامرازەی کە (ناو) دەبەستێت بە (ناو)ەوە، وەك:

بەرد (ی) دیوار

باخ (ی) میوە

پەرژین (ی) دارستان

یان، بریتیە لە ئەو ئامرازەی کە (ئاوەڵناو) دەبەستێت بە (ناو)ەوە، وەك:

بەرد (ی) سەخت

باخ (ی) جوان

پەرژین (ی) بەرز

ئەوەی سەیرە لە ئەم دوو دەستەواژەیەدا، ئەوەیە کە لە دەستەواژەی (ناو + ناو)دا، دوو ئامرازی ناساندن (ەکە) بۆیان هەیە بچەسپێن، چونکە دوو (ناو) هەیە، بەڵام لە دەستەواژەی دووەمدا هەر یەك ئامرازی (ەکە) بۆی هەیە کە بچەسپێت، چونکە یەك (ناو) هەیە، وەك:

ـ دەستەواژەی (ناو + ناو):

بەرد (ەکە) ی دیوار (ەکە)

باخ (ەکە) ی میوە (ەکە)

پەرژین (ەکە)ی دارستان (ەکە)

ـ دەستەواژەی (ناو + ئاوەڵناو)

بەردە سەخت (ەکە)

باخە جوان (ەکە)

پەرژینە بەرز (ەکە)

بەسەرنجێکی وردەوە، ئەگەر ئەو دوو دەستە نموونەیە بەراورد بکەین، چەند ڕاستییەك دەردەکەون, وەك:

یەکەم: وەك لە برگەی پێشتردا باسکرا، ئامرازی ناساندن (ەکە) بریتیە لە ئامرازی (ناو)، نەك (ئاوەڵناو). ئەمەش بەژمارەی (ناوەکان) و ئامرازەکەدا دیارە. بۆ نموونە لە ئەو شەش دەستەواژەیەدا، نۆ جار (ناو) بەکارهێنراوەو نۆ ئامرازی (ەکە) چەسپاوە.

دووەم: لە ئاستی دەستەواژەی (ناو + ئاوەڵناو)دا، ئامرازی (ی) گۆڕاوە و بووە (ـە)، چونکە ئامرازی (ەکە) هی ناوەکەیە، نەك هی ئاوەڵناوەکان.

## ٣- ٥ ـ ڕێزمانی ئاوەڵناو بە ئەندازە و پێوانە:

لە ئەو بابەتانەدا کە لەپێشەوە باس کران، سێ دیاردەی ئەندازەیی دەرکەوتن بۆ پێوانەکردنی ڕوهەندەکانی (ئاوەڵناو) و جوداکردنەوەی پسوولەکەی لە پسوولە (ناو)، وەك:

ئەندازەی یەکەم: لە ئاوەڵناودا، (میکانیزمی تەرخانکردن) بریتیە لە بارێکی گشتی و دەشێت، ئاوەڵناوی پێ بناسرێتەوە. بۆ نموونە، ئەگەر باری شێلوویی بە ئاوەڵناوەوە هەبێت، دەتوانین بی خەینەبەر میکانیزمی تەرخانکردن، وەك:

نەترس: (چاو) نەترس

سووتاو: (دەست) سووتاو

نووسراو: (ناو) نووسراو

کەواتە، ئەم وشانە ئاوەڵناوئاسان، چونکە دەشێت تەرخان بکرێن وەك (جوان: چاو جوان). بەواتایەکی دی، وشەکانی (نەترس، سووتاو، نووسراو) بریتیین لە جۆرێك (ئاوەڵناو) و ئاکاری (ئاوەڵناو) دەپارێزن، هەرچەندە لەکارەکانی (ترسان، سووتان، نووسین)ەوە دارێژرابن.

**ئەندازەی دووەم:** ئەو وشانەی کە لە ئەندازەی یەکەمدا خرانەبەر پێوانە، دەتوانرێت جارێکی تر بیانخەینەبەر ئەندازەی ئامرازی (ەکە)، وەك:

**نەترس: نەترسەکە**

**سووتاو: سووتاوەکە**

**نووسراو: نووسراوەکە**

ئەم نموونانە وەك (ناو) ئامرازی (ەکە) یان وەرگرت، بەڵام هی خۆیان نیەو هی (ناو)ێکی کرتاوەو دەتوانن ڕێ بدەن کە بگەڕێتەوە، وەك:

**کوڕەکە: کوڕە نەترسەکە: نەترسەکە**

**دارەکە: دارە سووتاوەکە: سووتاوەکە**

**نامەکە: نامە نووسراوەکە: نووسراوەکە**

لەسەر ئەندازەی،

**کچەکە: کچە جوانەکە: جوانەکە**

**ئەندازەی سێیەم:** لە دەستەواژەی (ناو + ناو)دا، ئامرازی (ەکە) بۆی هەیە بەکاربهێنرێت، چونکە دوو (ناو) لە ئارادابوون، لەبەرانبەردا، لە دەستەواژەی (ناو + ئاوەڵناو) هەریەك ئامرازی (ەکە) بۆی هەیە بچەسپێت، چونکە هەر یەك (ناو) لە

ئارادایە. کەواتە، لە ئاستی ئەو وشانەدا کە دەخرێنە بەر پێوانە، دەبێت هەر یەك ئامرازی (ەکە) بچەسپێت، وەك:

**کوڕە نەترسەکە، نەك (کوڕەکە نەترسەکە*)**

**دارە سووتاوەکە، نەك (دارەکە سووتاوەکە*)**

**نامە نووسراوەکە، نەك (نامەکە نووسراوەکە*)**

کەواتە، وەك ئەو وشانەی ئاکاری (ناو) پەسەند ناکەن(*) و یەك ئامرازی (ەکە) پەسەند دەکەن، دەشێت (ئاوەڵناو) بن، چونکە هاوسانن لە ئاستی ئامرازی (ەکە)دا. ئەوەش لەیاد نەکەین کە دەستەواژەی (کوڕەکەی نەترسەکە) واتای هەیە، بەڵام وەك (کوڕەکەی پیاوە نەترسەکە). ئەم نموونەیە جارێکی دی خۆی خۆی ڕاست دەکاتەوەو ئەو دوو ئامرازەی (ەکە) دەگەڕێتەوە بۆ دوو ناوەکە (کوڕ و پیاو)، نەك بۆ ئاوەڵناوی (نەترس).

ئەندازەی چوارەم: وشەی (ئاوەڵناو) دەلکێت بە ناوەوە بە یاریدەی ئامرازی بەستن (ی)، وەك:

**گوڵ (ی) گەش**

**هەنار (ی) مێخۆش**

لە ئەو دەستەواژانەدا، ئامرازی (ی) دەگۆڕێت بە (ـە) ئەگەر ئامرازی ناساندن (ەکە)، یان ئامرازی ئاماژە وەربگرن، وەك:

**گوڵ (ە) گەشەکە، ئەو گوڵ (ە) گەشە**

**هەنار (ە) مێخۆشەکە، ئەو هەنار (ە) مێخۆشە**

لە ئاستی ئەم ئەندازەیەدا، هەرسێ وشەی (نەترس، سووتاو، نووسراو) یەکسانن بە (ئاوەڵناو)، وەك:

کوڕ (ی) نەترس : کوڕ (ە) نەترسەکە: ئەو کوڕە (ە) نەترسە

دار (ی) سووتاو :دار (ە) سووتاوەکە: ئەو دار (ە) سووتاوە

وتار (ی) نووسراو: وتار (ە) نووسراوەکە: ئەو وتار (ە) نووسراوە

کەواتە، ئەو سێ وشەیە بریتیین لە (ئاوەڵناو)، چونکە هەر چوار ئەندازەکە دەچەسپێت بەسەریاندا.

## ٣- ٦ ـ بەرەنجام و لێکدانەوە:

- لە ئەم نووسینەدا، چوار ئەندازە بەکارهێنرا بۆ ناسینەوەی پسوولەی (ئاوەڵناو)، وەك:

ئەندازەی یەکەم: ئاوەڵناو ئاکاری تەرخانکردنی هەیە، وەك:

ناسك: دڵناسك

پاك: دڵپاك

نەترس: چاو نەترس

ئەندازەی دووەم: ئاوەڵناو ئامرازی (ەکە) وەرناگرێت و ئەگەر وەری گرت دەگەڕێتەوە بۆ ناوێکی کرتاو، وەك:

میوە(...)ەکە: میوە (ناسك)ەکە: (...) ناسکەکە

واتە، لە نێوان (ناو) و ئامرازی ناساندن (ەکە)دا، کە هی خۆیەتی، خانەیەکی بۆش (...) هەیە لە بیردا، کە هی ئاوەڵناوە.

**ئەندازەی سێیەم:** وەک (ئاوەڵناو) ئامرازی (ەکە) وەرناگرێت لە دەستەواژەی (ناو + ئاوەڵناو)دا هەریەک ئامرازی (ەکە) بۆی هەیە دەربکەوێت، وەک:

**کوڕە دڵپاکەکە، نەک (کوڕەکە دڵپاکەکە*).**

**ئەندازەی چوارەم:** لە دەستەواژەی (ناو + ئاوەڵناو)دا، ئامرازی (ەکە)، ئامرازی (ی) دەگۆڕێت بە (ـە)، وەک:

**سێوی شیرین، سێو (ە) شیرینەکە**

**هەناری مزر، هەنار (ە) مزرەکە**

- ڕەنگە هەندێک لە ئاوەڵناوەکان، وەک ئەوانەی لە ئەم نووسینەدا لێکدرانەوە (نەترس، سووتاو، نووسراو)، گفتوگۆیان لەسەر دابمەزرێت، بەڵام ئەو وشانە چی بن و لەچی سەرچاوەیەکەوە هاتبن پسوولەی جۆرێک ئاوەڵناویان هەیە.
- هەندێ جار بابەتەکە شێلوو دەبێت بە (ناو)ەوە. بۆ نموونە، وشەی (سەگ) ناوە، بەڵام بە خوازراوی بریتیە لە (ئاوەڵناو) و ئاکاری (ئاوەڵناو) پەسەند دەکات، وەک:

**سەگ، چاوسەگ، دڵسەگ، سەرسەگ**

**مشک، سمێڵ مشک، چاومشک**

**گورگ، دڵ گورگ، دەم گورگ**

ئـەم ئاوەڵنــاوە خوازراوانــە، ئـامرازی (ەکـە) وەرنــاگرن و ئەگـەر وەری بگــرن لەجیاتی ناوە (کوانوو)ەکە وەری دەگـرن. لەهـەمان کاتـدا، ئـامرازی (ی) دەگـۆڕن بـە ئامرازی (ـە) بە زەبری ئامرازی ناساندن (ەکە).

- لە هەنـدێك وشـەدا، بـاری دوو لایەنـە هەیـە. بـۆ نموونـە وشـەی (کـچ) دوو واتای هەیە، وەك:

کچ: بەواتای (ناو)ی (کچ)

کچ: بەواتای ئافرەتی شوو نەکردوو (ئاوەڵناو)

بێگومـان، لـە ئـەو دیـوەدا کـە وشـەی (کـچ) بریتیـە لـە (ئاوەڵنـاو) گشت ئەنـدازەکان دەچەسپێن بەسەریدا، وەك (کچە کچەکەیان) بەواتای (کچـە شـوو نەکردووەکـەیان). لـە ئێـرەدا، وشـەی (کـچ) لەبەرایيـدا، بریتیـە لـە (نـاو) و ئـامرازی (ەکـە) بـۆ ئـەو دەگەڕێتـەوە و وشەی دووەم (کچ) بریتیـە لـە (ئاوەڵنـاو) و ئـامرازی بەسـتن (ـە) بـۆ ئەو دەگەڕێتەوە.

- لە دەستەواژەییەکدا, وەك:

پیاوەکە: پیاو (ە) دڵبەرد(ەکە)

وشــەی (بــەرد) بریتیــە لــە (نــاو)، کەچــی ئاکـاری (ئاوەڵنــاو)ی وەرگرتــووە و بەتەرخانکردن بووە بە (دڵبەرد) وەك ( دڵپاك, دڵڕەق, دڵگەرم).

- هەنـدێك ئاوەڵنـاو هەیـە کـە بـە ئـامرازی (ـین) دروسـت کـراون بـە واتـای (دروستکراو لەتشتێك)، وەك:

زیو: زیوین,   زێڕ: زێڕین

ئاسن: ئاسنین,   دار: دارین

دوا : دوایین   پۆڵا: پۆڵایین

ئەم وشانەش ئاکاری ئاوەڵناو پەسەند دەکەن، وەك:

زیوین؛ (ڕەنگ) زیوین, وەك ڕەنگ تۆخ

- یان،

ڕەنگ (ە) زیوینەکە, وەك ڕەنگە تۆخەکە

- یان,

ئەو ڕەنگ(ـە) زیوینە, وەك ئەو ڕەنگە تۆخە

- ئەو ئەندازانەی کە لەنێو ئەم نووسینەدا بەکارهێنران دەتوانن ببن بە فیلتەرێکی بەکار، یان بە ئەندازەیەکی بەبڕشت بۆ هاوێرکردنی (ئاوەڵناو) لە زمانەکەدا. ئێمە لە ئەو باوەڕەداین، جۆرە بابەتی ئاوها کاریگەری لەلای منداڵ زۆرترەو ئەگەر فێری ببن مامۆستاکانیان بێزار دەکەن بە پرسیاری (نەستەق و بەجێ), لە سەر نموونەی ( ئاوەڵناوی ڕەبەق)

★ گۆڤاری (رامان)، ژمارە (٩٢) ساڵی (٢٠٠٥).

# بەشی چوارەم

# تایبەتمەندی ئاوەڵناو لە ئامرازی کۆ (ــان)دا

## ٤-١ـ دەستێك:

لەزمانانی عەربی و ئنگلیزی و فەرەنسیدا، بەپێی شارەزایی خۆمان، ئامرازی کۆ رەهاو ئازادە بۆ ئەوەی بەراستەوخۆیی بچێتە سەر (ناو)، بەڵام لە زمانی کوردیدا دەرگاکە هەروا کراوە نیە و ئامرازی کۆ (ان) بۆی نیە بچێتە سەر (ناو) بەڕاستەوخۆیی. لەبەرانبەردا، ئەو ئامرازە بۆی هەیە بچێتە سەر (ئاوەڵناو). بەواتایەکی تر، ئامرازی کۆ (ان) ناچێتە سەر (ناو)، مەگەر بە یاریدەی کەرەستەکی سێیەم، بەڵام زۆر بە رەهایی دەچێتە سەر (ئاوەڵناوی کەسان و پیشەوەران). بۆ نموونە، زۆر دەگمەنە ئەم ناوانە بەراستەوخۆیی بکرێن بە (کۆ*)، وەك رێزماننووسان نەیان توانیوە بەکوردی بیر بکەنەوەو کردوویانن بە (کۆ):

بەرد: بەردان*

خانوو: خانووان*

کەڵك: کەڵکان*

ئاگر: ئاگران*

مەڕ: مەڕان*

ئەسپ: ئەسپان*

## ٤-٢- ئاوەڵگوزارەی کات:

ئەم ئامرازە (ان) دەچێتەسەر ناوی (کات) و دەی کات بە ئاوەڵگوزارەی کات، وەك:

هاوین: هاوینان، زستان: زستانان

بەهار: بەهاران، پاییز: پاییزان

ئێوارە: ئێواران، بەیانی: بەیانیان

نیوەڕۆ: نیوەڕۆیان، عەسر: عەسران

دەمەو ئێوارە: دەمەو ئێواران

سەر لەبەیانی: سەرلەبەیانیان

پارشێو: پارشێوان، نەورۆز : نەورۆزان

درەنگ : درەنگان، ناوەخت: ناوەختان

پێشوەخت: پێشوەختان، شەو: شەوان...

لەم نموونانەدا، هەرچەندە ئامرازی (کۆ) چەسپابێت بە نووسین و بەکۆکردن، بەڵام واتای تایبەتی ( ئاوەڵگوزارەی کات) خۆی سەپاندووە و ئەرکی ئامرازەکەی گۆڕیوە.

### ٤- ٣ ـ ئامرازی کۆ لە ئاستی ئاوەڵناودا:

لە ئاستی ئاوەڵناودا هەڵوێستەکە زۆر جودایە و ئامرازەکە زۆر ڕەهایە، وەك:

جوان: جوانان

چاوجوان: چاو جوانان

زانا: زانایان

قوتابی: قوتابیان

ژن: ژنان

مامۆستا: مامۆستایان

ئەندازیار: ئەندازیاران

بەرپرس: بەرپرسان

منداڵ: منداڵان

ئەم ئامرازە دانامێنێت لە ئاستی ئاوەڵناوی کەسی و پیشەیی، لەگەڵ ئەوەشدا دەرگاکە وا زۆر کراوە نیە، چونکە واتای تایبەتی (کەسان) دەچەسپێت، وەك:

کەسی جوان: کەسانی جوان: جوانان

کەسی چاو جوان: کەسانی چاو جوان: چاو جوانان

کەسی مامۆستا: کەسانی مامۆستا، مامۆستایان

بۆ نموونە وشەی (جوانان) بەهیچ جۆرێك ناگەڕێتەوە بۆ (بێ گیان*) و واتای جوانی (کەسان) هەڵدەگرێت. لەبەرانبەردا وشەی (جوان) بەتاکی، دەشێت لە (کەس) و لە (بێ گیان) بکەوێتە گەڕ وەك:

خانووی جوان: (جوانان*)

کچی جوان: جوانان

## ٤- ٤ ـ ئامرازی (کۆ) لە ئاستی بابەتی تردا:

ئامرازی (کۆ) دەچێتەسەر ئەم بابەتانە:

یەکەم: ئامرازی ناساندن (ەکە)، وەك:

ـەکە + ان ← ـەکان

پیاو + ەکە + ان ← پیاوەکان

دووەم: ئامرازی ئاماژە، وەك:

ئەم (...) ـە + ان ← ئەمـ (...) انە

ئەو (...) ـە + ان ← ئەو (...) انە

**سێیەم:** ئامرازی گەیاندن، وەك:

**ئەو (...)ەی کە + ان ← ئەو (...) انەی کە ...**

**ئەم (...)ەی کە ← ئەم (...) انەیکە ...**

**چوارەم:** جێناوی لکاو لە پۆلی دووەم، وەك:

**جێناوی لکاو (م) + ان ← (مان)**

**جێناوی لکاو (ت) + ان ← (تان)**

**جێناوی لکاو (ی) + ان ← (یان)**

**یەکەم:** جێناوی کەسی سێیەمی تاك، وەك:

**ئەو + ان ← ئەوان (بۆ دوور)**

**ئەم + ان ← ئەمان (بۆ نزیك)**

ئەوەی سەیرە جێناوەکانی (ئەوان، ئەمان) یان جێناوە لکاوەکانی (مان، تان، یان) ڕەسەنترین جۆری نیشانەی کۆ هەڵ دەگرن و دەستپێکی ئەم گەمەیە دیاری دەکەن لە ڕێزمانی کوردیدا.

## ٤- ٥ ـ پردێك لە نێوان ئامرازی کۆ و (ناو)دا:

لە ئەم هەڵویستەدا، دەتوانین چەند ڕاستییەك بخەینەڕوو، وەك:

**یەکەم:** سەرپاکی ناوی زمانەکە بۆی هەیە لەگەڵ ئامرازی ناسندن (ەکە) بگوزەرێت، وەك:

**پیاو + (ەکە) : پیاوەکە**

**دووەم:** سەرپاکی ناوی زمانەکە بۆی هەیە لەگەڵ ئامرازی ئاماژە بگوزەرێت، وەك:

**ئەو (...) ە + (پیاو) ← ئەو (پیاو)ە**

**سێیەم:** سەرپاکی ناوی زمانەکە بۆی هەیە لەگەڵ ئامرازی گەیاندن بگوزەرێت، وەك:

**ئەو (...) ەی کە (هات) + (پیاو) ← ئەو (پیاو)ەی کە هات**

**چوارەم:** هەرسێ ئامرازی ناسراوی (ەکە) و ئامرازی ئاماژە (ئەوە، ئەمە) و ئامرازی گەیاندن (ئەوەی کە ...، ئەمەی کە ...)، بۆیان هەیە کە نیشانەی (کۆ) وەربگرن، نەخشەی (٤-١).

| بابەت | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| ئامرازی ناسراوی | ەکە | ەکـ(ـان) |
| ئامرازی ئاماژە | ئەو ...ە<br>ئەمـ ... ە | ئەو... (انـ)ـە<br>ئەمـ ... (انـ)ـە |
| ئامرازی گەیاندن | ئەو...ەی کە...<br>ئەمـ...ەی کە... | ئەو...(ان)ـەی کە...<br>ئەمـ...(ان)ـەی کە ... |

نەخشەی (٤-١): نیشانەی کۆ (ان) لە ئامرازەکانی (ناساندن، ئاماژە، گەیاندن)دا.

**پێنجەم:** وەك ئەم ئامرازانە ڕەهان لە وەرگرتنی ئامرازی کۆ (ان) و (کۆمەڵەی ناو)یش ئازادە لە وەرگرتنی ئەو ئامرازانە، کۆمەڵەی (ناو) لەڕێی ئەو ئامرازانەوە، بە ئازادی ئامرازی کۆ (ان) وەردەگرێت، وەك:

- بە ڕێگای ئامرازی ناسراوی:

**دیوارەکە← دیوارەکان**

- بە ڕێگای ئامرازی ئاماژە:

**ئەو دیوارە← ئەو دیوارانە**

- بە ڕێگای ئامرازی گەیەنەر:

**ئەو دیوارەی کە ڕووخا: ئەو دیوارانەی کە ڕووخان**

**شەشەم:** وشەی (دیوار) بۆی نیە وا بەئاسانی ببێت بە (دیواران). هەر لەبەر ئەوە، هەبوونی ئامرازی کۆ (ان) لەوشەی (دیوارەکان)دا زۆر ئازادەو رەهایە، چونکە بەناراستەوخۆیی, لە رێگای ئامرازی ناسراوی (ەکە)وە, وەری گرتووە.

**حەوتەم:** بەهەمان شێواز، وشەی (دیواران) زۆر نامۆیە, ئەگەر بەرووتی گۆ بکرێت، کەچی زۆر ئاساییە ئەگەر لە بارگەی ئامرازی ئاماژەو ئامرازی گەیەنەردا گۆ بکرێت، وەك:

ئەو (دیواران) ـە

ئەو (دیواران)ـەی کە رووخان

**هەشتەم:** وەك حەشارگەیەکی زمانی کوردی ئامرازی کۆ (ان) لە وشەی (دیواران)دا دەگەڕێتەوە بۆ ئامرازی (ەکە) و ئامرازی ئاماژەو ئامرازی گەیەنەر. بەواتایەکی دی، ئامرازی ناسراوی (ەکە) و ئامرازی ئاماژەو ئامرازی گەیەنەر ناوی (تاك) وەردەگرن و هەر خۆیان دەی کەن بە کۆ بە ئامرازی (ان)، نەك بە راستەوخۆیی بە ناوی (کۆ).

**نۆیەم:** بە تەریبی لەگەڵ ئاوەڵگوزارەی کاتدا، لە ئەو جێیانەدا کەواتای ئاوەڵکاری شوێن بچەسپێت، دەشێت ئامرازی کۆ (ان) بخرێتە سەر ناو، وەك:

بەرماڵ: بەرماڵان, بن دیوار: بن دیواران

ناو کۆڵان: ناو کۆڵانان, ناو دڵ: ناو دڵان

سەربان: سەربانان, ژێر لێو: ژێر لێوان

پشت ماڵ: پشت ماڵان, هەوار : هەواران

بنار : بناران, زنار: زناران, هەوار : هەواران

## ٤- ٦ - بەراورد لەگەڵ زمانانی تردا:

بە بەراورد لەگەڵ زمانانی تردا، وەك عەرەبی، ئینگلیزی، فەرەنسی، زمانەکەمان مۆرکی تایبەتی خۆی هەیە، وەك:

**یەکەم**: لەزمانی عەرەبیدا، ئامرازی ناسراوی (الـ) بۆ تاك و کۆ هەر یەك ڕووخساری هەیە، کەچی لەزمانی کوردیدا جودایە، روخساری (ەکە) بۆ (تاك) و روخساری (ەکان) بۆ (کۆ).

**دووەم**: لەزمانی ئینگلیزیدا، ئامرازی ناسراوی (The) بۆ تاك و کۆ هەر هەمان روخساری هەیە، کەچی لە کوردیدا وا نیە.

**سێیەم**: لەزمانی فەرەنسیدا، وەك کوردی، ئامرازی ناسراوی دوو روخساری هەیە (Le) و (La) بۆ تاکی (نێر) و (مێ) و (Les) بۆ کۆ بەگشتی.

**چوارەم**: بەرانبەر بە هەرسێ زمانی (عەرەبی، ئینگلیزی، فەرەنسی)، زمانی کوردی مۆرکێك دەبەخشێت لە ئاستی ئامرازی ئاماژەدا، نەخشەی (٤- ٢).

| زمان | نموونەی ئامرازی ئاماژە |
|---|---|
| کوردی | ئەو قوتابیانە |
| عەرەبی | هؤلاء الطلاب |
| ئینگلیزی | These students |
| فەرەنسی | Ces etudiants |

نەخشەی (٤- ٢): ئامرازی ئاماژە بە بەراورد.

بەراوردی نێوان ئەو نموونانە دەری دەخات کە لە کوردیدا توخمی (کۆ) تەنها لە ئامرازەکەی ئاماژەدا هەیە، وەك: (ئەوانە). چونکە وشەی (قوتابی) توخمی کۆی هەڵ نەگرتووە. کەواتە, بە ئامرازی ئاماژەو بەناوەکەی خۆی یەك توخمی (کۆ) هەڵدەگرن. لە بەرانبەردا، لە نموونەی ئەو زمارانەدا توخمی (کۆ) دووجار چەسپاوە،

جارێك لە ئامرازی ئاماژەدا و جارێك لە ناوەكەدا. بێگومان ئەم مۆركە ڕەنگینە زمانی كوردی لە ئەو سێ زمانەجودادەكاتەوە. كەواتە, جیاوازییەكی ریشەیی دەردەكەوێت لەنێوان زمانی كوردی و ئەو زمانانەدا كە بەراوردكراون لەگەڵیدا. ئەم جۆرە جیاوازییە ڕەنگە خەڵكی دیكە بەسەریدا بڕۆن و پێی نەزانن، بەڵام ئێمە لە ڕەگ و ریشەوە دەری دەئاژنین و دەیخەینە بەر مەكینەی ڕێزمانی تۆماركراو.

## ٤- ٧ - پوختەكاری:

لە كۆتاییدا, هەندێك بەرەنجامی رەسەن و كاریگەر هەن, كە شایستەی ئەوەن كە بە تۆخی لە سەر بەرگی ئەتڵەسی ڕێزمانی كوردی بیان نووسین. ڕێزماننووسانیش بۆیان هەیە رەخنەیان لێ بگرن و نووسین و كتێبی لەسەر بلاو بكەینەوە, وەك:

یەكەم: كۆمەڵەی ناو ناتوانێت بە ئاسانی ئامرازی كۆ (ان) وەربگرێت، ئەگەر وەری گرت، ئەوا مەبەستێك حەشار دەدات لەواتاكەیدا، چی بۆ ئاوەڵگوزارەی (كات) و، چی بۆ ئاوەڵگوزارەی (شوێن) و چی بۆ ئاوەڵناوی كەسان.

دووەم: لەزمانەكەی ئێمەدا هەر (ناو)ێكی تاك بەرێگایەكی ناراستەوخۆ دەتوانێت ئامرازی كۆ (ان) وەربگرێت، بەواتایەكی دی، هەر (ناو)ێك بۆی هەیە بە یاریدەی ئامرازی (ەكە) و ئامرازی ئاماژەو ئامرازی گەیەنەر، نیشانەی كۆ (ان) وەربگرێت.

سێیەم: نیشانەی كۆ (ان) لە دەستەواژەی ناوی كۆدا ناگەڕێتەوە بۆ ناوەكە خۆی، بەڵكو دەگەڕێتەوە بۆ ئامرازەكان، وەك لە ئامرازی ناسراوی (ەكە) و ئامرازی ئاماژەو ئامرازی گەیەنەردا دەچەسپێت.

چوارەم: ئامرازی ناسراوی (ەكە) و ئامرازی ئاماژەو ئامرازی گەیەنەر ناوی (تاك) وەردەگرن، نەك ناوی (كۆ). ئەو ئامرازانە خۆیان توخمی (كۆ) هەڵدەگرن و خۆیان, بە واتای ڕێزمانی خۆیان, ناوە تاكەكە دەكەن بە (كۆ).

**پێنجەم**: ئامرازی کۆ (ان) زۆر ئازادە لە ئاستی (ئاوەڵناو) و (ناوی پیشەیی). لەم هەڵوێستەدا, ناوە کۆیەکە واتای (کەسان) دەبەخشێت، نەك هەر (کۆ)ی ئاوەڵناوەکە بە تەنها.

**شەشەم**: لەزمانی عەرەبی و ئینگلیزی فەرەنسیدا، دەستەواژەی ئامرازی ئامآژەو ئامرازی گەیەنەری دوو توخمی (کۆ) هەڵدەگرن، یەکەمیان لە ئاستی ئامرازەکەدا و دووەمیان لە ئاستی ناوەکەدا. لەزمانی کوردیدا، هەر یەك توخمی (کۆ) هەیە کە لە ئامرازەکەدایەو بەس. ئەمەش خۆی لەخۆیدا بریتیە لە مۆرکێکی وردو دانسقە و لە حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی.

---

* گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٩٩) ساڵی ٢٠٠٥.

# بەشی پێنجەم

# چەند وێستگەیەك لە ڕێزمانی ئاوەڵناودا

## ٥-١- دەستپێك:

سەبارەت بە (ئاوەڵناو) و بە ڕێزمانەکەی، ئێمە زۆرمان نووسیوە، بەلام هێشتا بە سفتی نەترنجاوەتە نێو چوارچێوە. ئەمەو لەهەر هەلوەستەیەکدا، چەندین خالّی دیکە دەهێنینە پێش چاو و چەندین سەرنجی دیکە دەهێنینە بەر تۆمارکردن. هەر لەبەر ئەوە، لە دەروازەی ئەدگارەکانی زمانی کوردییەوە، ئێمە حەز دەکەین بایەخێکی زۆرترو گرینگییەکی بەرینتر بدەین بە ڕێزمانی ئاوەڵناو. لە ڕاستیدا، لەم خێزانە زمانەی ئێمەدا بابەتی (ناو) و (ئاوەڵناو) تایبەتمەندییەك نیشان دەدەن، کە بەرێزمانی خێزانە زمانەکانی دیکە لێك نادرێتەوە، مەگەر بەرێزمانێکی نارێك و ناقۆلا. لە دوو توێی ئەم نووسینەدا، لەرێزمانی (ئاوەڵناو)دا، بە چەند وێستگەیەکدا تێدەپەڕین و مەرجیش نیە گشت خالّەکان دانسقەو داهێنراوبن. بۆ نموونە، تێیدا هەیە کە پێشتر باسکراوە لەلایەن ڕێزماننووسانەوە، یان تێیدا هەیە کە خۆمان لەسەریمان نووسیوە. لەگەلّ ئەوەشدا، هەندێك وێستگەی تێیدا هەیە، کە بۆ مەبەستی لێکۆلینەوە، زۆر کراوە لە (ئاوەڵناوەکان) بۆ ئەوەی ئاکاری تازەیان لێ دەربکەوێت. سەرەڕای گشت ئەوانە، بابەتەکە بووە بە کشتەکێکی درێژو بەزۆربەی وێستگەکانی ڕێزمانی (ئاوەڵناو)دا تێپەڕیوەو نەختێك لەسەر باری ستوونی بابەتەکانی خستووەتە بەر مەکینەی ڕێزمان.

بەهیواین بەکۆی گشت وێستگەکان و بە ئەو دەرەنجامەی کە تۆمار کراون، توانیبێتمان نەختێك جوانترو ڕەوانتر بابەتەکە ڕوون بکەینەوە.

## ٥- ٢ - تەرخانکردنی (ئاوەڵناو):

لە ڕێزمانی کوردیدا ئاوەڵناوی گشتی و پەتی هەموو کاتێک میکانیزمێک پەسەند دەکات بۆ تەرخانکردنی واتایی. بۆ نموونە، ئاوەڵناوی (پاک) دەتوانێت ئەم ئاوەڵناوە تەرخانکراوانە چێ بکات، وەک:

| | |
|---|---|
| پاک | دڵپاک |
| | ڕووپاک |
| | دەستپاک |
| | سەرپاک |
| | چاوپاک |
| | دەروونپاک |
| | داوێنپاک |

لە ڕاستیدا، دەرگای ئەم میکانیزمە والآیە و هەر کەسێک سەر پشکە لە دارژتنی ئاوەڵناوی (تەرخانکراو)دا، وەک:

پاشەڕۆژ: پاشەڕۆژ پاک

دەفتەر: دەفتەر پاک

چارەنووس: چارەنووس پاک

ماڵ: ماڵ پاک

ئیش: ئیش پاک

پیشە: پیشە پاک

چێشت: چێشت پاک

دەست: دەستپاک

بۆ نموونە، ئاوەڵناوی (دەستپاك) دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی، کە سەرڕاستە و ئیشی دەستی پاکە.

## ٥- ٣ ـ ئامرازی بەستن (ـە):

لە دەستەواژەی (ناو و ئاوەڵناو)دا، وەك(دڵی پاك)، ئامرازی ناسراوی (ەکە)، یان ئامرازی ئاماژە (ئەو ـ ە)، ئامرازی (ی) دەگۆڕێت بە (ـە)، وەك:

**دڵ (ـە) پاکەکە : ئەو دڵ (ـە) پاکە.**

## ٥- ٤ ـ ئامرازی ناسراوی (ەکە):

بێگومان (ئاوەڵناو) ناتوانێت ئامرازی ناساندن (ەکە) وەربگرێت و ئەگەر وەری گرت، ئەوا هی خۆی نیەو هی ئەو ناوەیە کە پێوەی نووساوە، بەڵام ڕێزمانەکە ڕێی داوە کە پیادە بکرێت، وەك:

**بەردەکە: بەرد (ە) گەورەکە: گەورەکە**

لە ئێرەدا، ئامرازی (ەکە) دەگەڕێتەوە بۆ ناوی (بەرد) بەڵام لە دەستەواژەی (گەورەکە)دا، ناوی (بەرد) کرتاوەو دەتوانین بیگەڕێنینەوە، وەك (بەردە گەورەکە).

## ٥- ٥ ـ ئامرازی نەرێ (نا):

لە ڕێزمانی کوردیدا، بابەتی (ئاوەڵناو) بە ئامرازی (نا) دەبێت بە نەرێ، وەك:

**لەبار: (نا)لەبار، شیرین: (نا) شیرین**

**خۆش: (نا)خۆش، پاك: (نا)پاك**

**بەجێ: (نا)بەجێ، دروست: (نا)دروست**

**ڕێك: (نا) ڕێك، شاد: ناشاد**

ئەمەو دەرگای ئەم جۆرە (ئاوەڵناو)ە نیمچە والآیە، بەڵام رۆژگار دروستیان دەکات، بۆ نموونە ئاوەڵناوی (ناجوان، نا ئەستوور، ناتەخت، نابەرز، نا ئاشت، ..تاد) رەنگە ئەمرۆ رووی بەکارهێنانیان نەبێت، بەڵام دەشێت لە رۆژێکدا تینی زاراوە وەربگرن و لەرووبەری زمانەکەدا بکەونە گەڕ.

## ٥- ٦ ـ ئامرازی نەریٚ (نە):

لە ئەو ئاوەڵناوانەدا کە ئامرازی (نە)ی (نەریٚ) برەوی هەیە، (ئاوەڵناو)ەکە لە کارەوە وەرگیراوە و ئەو ئامرازە (نە) دەگەڕێتەوە بۆ ڕێزمانی(کار) نەك بۆ ڕێزمانی (ئاوەڵناو)، وەك:

سووتاو: (نە)سووتاو

سووتێنراو: (نە)سووتێنراو

دڵسووتێن: دڵ (نە)سووتێن

سووتێنەر: (نە)سووتێنەر

سووتا: (نە)سووتا

ئەوەش لەبیر نەکەین کە ئامرازی نەریٚ (نە) زۆر جیاوازە لە ئامرازی (نا)، چونکە نیشانەی (نە) رەهایە و لە پەرێزی کاردایە و نیشانەی (نا) لە پەرێزی هەندێك ئاوەڵناودا هەیە, وەك لە پێشەوە باسکرا.

## ٥- ٧ ـ نموونەیەکی سەیر:

لە ئاوەڵناوێکدا وەك (خۆش)، نیشانەی نەریٚ بە هەردوو جۆرەکەی (نا) و (نە) دەچەسپێت، بۆ دوو واتای جیاواز، وەك:

نیشانەی نەریٚ (نا): ناخۆش

نیشانەی نەریٚ (نە): نەخۆش

بێگومان, واتای هەردوو شێوەی (ناخۆش) و (نەخۆش) زۆر لە یەکتری جودان، لە ئاستی ئاوەڵناوی (ناخۆش)دا میکانیزمەکە ئاشکرایەو ئاوەڵناوی (خۆش) نیشانەی نەرێی ئاوەڵناوی وەرگرتووە. بەلأم لە ئاستی ئاوەڵناوی (نەخۆش)دا، لێڵی هەیەو وا پێدەچێت کە وشەی (خۆش) بریتی بێت لە ڕەگی کارێك، وەك (خۆش بوون)، یان کارێکی دی وەك (خۆشان: دەخۆشێت: خۆشا: خۆشاوە).لە ئێرەدا, وەك هەردوو وشەی (ناخۆش) و (نەخۆش) نرخی واتایی جیاوازیان هەیە, دەشێت حەشارگەیەك لە ئارادابێت.

## ٥- ٨ ـ ئاوەڵناو بەناوی دووبارە:

زۆرجار ئاوەڵناو بە دووبارەکردنەوەی ناوێك پەیدا دەبێت، وەك:

**چاڵ چاڵ، کون کون، شاخ شاخ، گرد گرد، دۆڵ دۆڵ، پارچە پارچە، بڕ بڕ، خاڵ خاڵ، دانە دانە... هتد.**

ئەم جۆرە ئاوەڵناوانە برەویان کەمە، بەلأم شێوەی دارشتنیان زۆرجار ئاسانە و زۆرجار لە کاتی نووسین و ئاخاوتندا پەیدا دەبن. لەگەڵ ئەوەشدا، دەرگای ئەم میکانیزمە ڕێزمانییە والأیە بۆ هەمووان بۆ دروستکردنی ئاوەڵناو بە دووبارەکردنەوەی (ناوێك) بەبێ هیچ گەردیلەیەکی ڕێزمانی لەنێوان هەردوو ناوە دووبارەکەدا.

## ٥- ٩ ـ ئاوەڵناوی دووبارە:

زۆرجار ئاوەڵناوی دووبارە ریز دەبێت لەگوفتارا، وەك:

**جوان جوان، باش باش، تەڕ تەڕ، گەش گەش، خۆش خۆش.**

ئەم جۆرە دەستەواژەیە سێ واتای جیاواز دەبەخشن، وەك:

**واتای یەکەم**: واتای ئاوەڵگوزارەیی، وەك:

**شیلان جوان جوان دانیشت**

به واتای (شیلان بەرەبەرە بە جوانی دانیشت)

**واتای دووەم**: واتای چەندایەتی ئاوەڵناو، وەك:

**شیلان جوان جوان بووە**

**شیلان تەڕ تەڕ بووە**

بەواتای:

**شیلان (زۆر) جوان بووە**

**شیلان (زۆر) تەڕ بووە**

**واتای سێیەم**: واتای بەراورد بە پێشگری (هەرە ـ)، وەك:

**باشباشەکەی بە چەندە؟**

بەواتای:

**هەرە باشەکەی بە چەندە؟**

### ٥- ١٠ ـ ئاوەڵناو وەك کوانووی ناوی واتایی:

ئاوەڵناو دەتوانێت ببێت بە کوانووی جۆرەکانی ناوی واتایی، وەك:

**یەکەم**: ناوی واتایی پەتی، وەك:

**جوان: جوانی**

**ناسك: ناسکی**

دووەم: ناوی واتایی جێگەیی، وەك:

ناسك: ناسکایی

تەنك: تەنکایی

سێیەم: ناوی واتایی لەگەڵ کاری (بوون)، وەك:

جوان: جوانەتی، جوانێتی

ناسك: ناسکەتی، ناسکێتی

چوارەم: ناوی واتایی بۆ پەیوەندی نێوان کەسان، وەك:

کورد: کوردایەتی

مامۆستا: مامۆستایەتی

پێشمەرگە : پێشمەرگایەتی

## ٥- ١١ ـ ئاوەڵناو وەك ئاوەڵگوزارە بەڕاستەوخۆیی:

لەزۆرجێدا، ئاوەڵناو دەبێت بە ئاوەڵگوزارە، وەك:

شیلان (جوان) دانیشت

ئازاد (ڕێك) دەنووسێت

بەواتایی:

شیلان (بەجوانی) دانیشت

ئازاد (بەڕێکی) دەنووسێت

### ٥- ١٢ ـ ئاوەڵناو لە ئاوەڵگوزارەدا:

لەزۆر جێدا ب مناڕاستەوخۆیی، ئاوەڵناو دەبێت بەناوی واتایی،(باسکراو لە پێشتردا). ئەمجارەیان ئەو دەستەواژەیە بە بەکارهێنانی ئامرازی (بە) دەبێت بە ئاوەڵگوزارە بۆ دەرخستنی نەریتی ڕوودانی ڕستەیەك، وەك:

شیلان (بەجوانی) دانیشت

شیلان (بەهوردی) نامەکەی نووسی

## ٥- ١٣ ـ ئاوەڵناو بە ئامرازی (ین):

ئەمجۆرە ئاوەڵناوە بەڕادەی ماك وماددەی تشتەکە بنیادنراوە، وەك:

ئاسن: ئاسنین: پردی ئاسنین

زیو: زیوین: گوارەی زیوین

پۆڵا: پۆڵایین: کۆشکی پۆڵایین

دار: دارین: دەستی دارین

بەرد: بەردین: کۆشکی بەردین

ئاگر: ئاگرین: خەمی ئاگرین

لە ئەم جۆرە ئاوەڵناوەدا، دەنگی (ی) لە ئامرازی (ـین)دا بەبزوێنی دەمێنێتەوە و نیمچە بزوێنایەتی پەسەند ناکات، وەك (پۆڵا: پۆڵایین). بەم کردەوەیە سەری حەشارگەیەك دەدۆزێتەوە، چونکە ئامرازی ئاوەڵناو (ـین) جودا دەبێتەوە لەجێناوی لکاو (ـین)، وەك:

ئێمە وەك پۆڵاین ؛ قەڵای پۆڵایین

سەرنجێکی دیکە لەسەر ئەمجۆرە ئاوەڵناوە هەیە، ئەوەیش ئەوەیە کە ئاوەڵناوەکانی (شیرین، ڕەنگین، سەنگین، بەفرین... هتد) لەئەمجۆرە دەچن، بەڵام نەختێك بەلێڵییەوە.

## ٥- ١٤ ـ ئاوەڵناوی بەراوردکراو:

زۆرجار پلەی ئاوەڵناو دیاری دەکرێت بە بەراورد لەنێوان دوو تشت یان دوو کەسدا، یان لە بێوان زێدەتردا:

**جوان: جوانتر: جوانترین**

لەگەڵ ئەوەشدا، زۆرجار ئامرازێکی دەرەکی دەخرێتەسەر ئاوەڵناو، وەك:

**جوان: هەرە جوان**

**ناسك: هەرە ناسك**

بێگومان پلەی بەراوردکاری بەسفتی دیارە بە (جوان: جوانتر: جوانترین) دوە، بەڵام ئەمجۆرەی دوایی (هەرە جوان) تشتێك، یان کەسێك دەکات بە (بەربژار) لەنێو ڕێزێکدا.

## ٥- ١٥ ـ ئاوەڵناوی نەرێ:

هەندێك ئاوەڵناو هەن لەدیوی (ئەرێ)دا برشتیان زۆر کەمەو زۆر بێ برەون، بەڵام لەدیوی (نەرێ)دا زۆر بە برەو و بەربڵاون لە بەکارهێناندا، وەك:

**نەمر، نەسووت، نەکوڵ، نەدار، نەگۆڕ، نەخەو، نەسرەو، نەشك... هتد.**

ئێستاش ئەگەر دیوی (ئەرێ)ی ئەم ئاوەڵناوانە بەراورد بکەین، دەبینین کە جیاوازییەکی زۆر هەیە، بۆ نموونە (نەمر، نەبەز) بڕەویان یەکجار زۆرە، بەلآم (بمر، ببەز) بڕەویان هەر نیە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا بریتیە لە نهێنیەك لە نهێنیەکانی ئاوەڵناو.

## ٥- ١٦ - جێگۆڕینی ئاوەڵناو:

لەهەندێك باردا، ئامرازی (ی) لە دەستەواژەی (ناو ئاوەڵناو)دا، دەکرێت بە (ـە) بەبێ ئەوەی زەبری ئامرازی ناساندن (ەکە) یان ئامرازی ئاماژە (ئەو...ە) لە ئارادا بێت، وەك:

لیمۆ (ی) زەرد: زەرد (ە) لیمۆ

پیاوی (ی) بۆر: بۆر (ە) پیاو

موو (ی) گەند : گەند(ە) موو

گوڵ (ی) سوور: سوور (ە) گوڵ

ساڵ (ی) وشك: وشك (ە) ساڵ

بەهێ (ی) کاڵ: کاڵ (ە) بەهێ (کاڵەبەی).

لەم نموونانەدا چەند سەرنجێك هەیە:

١- ئەم دیاردەیە تایبەتی و بەرتەسکەو گشتی نیە، واتە لە هەندێك باردا گونجاوە, بەلآم دەرگاکەی والآ نەکردووە بۆ گشت نموونەیەك.

٢- بەگۆڕینی ئامرازی (ی) بۆ ڕوخساری (ـە), (ناو)ەکەو (ئاوەڵناو)ەکە جێیەکانیان گۆڕیوە بە (چەپ و ڕاست) و لەجێی یەکتری دانیشتوون. واتە، ئاوەڵناوەکە چووەتە پێش ناوەکە، یان بە پێچەوانەوە. بۆ دەرخستنی ئەم دیاردە ڕێزمانیە, لیستێك لە ئەو نموونانە دەخەینەڕوو، وەك:

پیاوی نەرم: نەرمە پیاو، نانی گەرم: گەرمە نان

تەنووری گەرم: گەرمە تەنوور, تەنووری سارد: ساردە تەنوور

بیبەری سوور: سوورە بیبەر, شەوی تاریك: تاریكە شەو

ڕەوتی نەرم: نەرمە ڕەوت, پیاوی کەڵ: کەڵە پیاو

دومەڵی کوێر: کوێرە دۆمەڵ, بای ڕەش: ڕەشەبا

هەنگاوی ورد: وردە هەنگاو, داری ورد: وردە دار

نانی ورد: وردە نان, بەردی خڕ: خڕە بەرد

داری تەخت: تەختە دار, خزمی دوور: doورە خزم

نۆکی فەریك: فەریكە نۆك, ماری کوڵ: کوڵە مار

زاوای تازە: تازە زاوا, ڕێی ڕاست: ڕاستەڕێ

٣ ـ لەسەر ئەندازەی ئەو نموونانە، دەبینین چەندین نموونەی دیکە هەیە کە (ناو) دەبەستێت بەناوێکی دیکەوە، وەك:

بەرد (ی) ئەستێ: بەرد (ە) ئەستێ

دەرد (ی) گا: دەرد (ە) گا

ماڵ (ی) هەزار: ماڵ (ە) هەزار

بەرد (ی) نوێژ: بەرد (ە) نوێژ

بەرد (ی) باز: بەرد (ە) باز

لە ئەو نموونانەدا, دیاردەی جێگۆڕین ڕووی نەداوەو هەردوو وشەکە، یان هەردوو ناوەکە، لەجێی خۆیان وەستاون، چی لەگەڵ ئامرازی (ی) و چی لەگەڵ ئامرازی (ـە). لە نموونەکانی پێشتردا، کە لەجیاتی دوو (ناو)، (ئاوەڵناو) و (ناو) بەکارهێنراون، دیاردەی جێگۆڕین چەسپاوە, وەك (هەناری مزر : مزرەهەنار).

### ٥- ١٧ - پوختەکاری:

- لەقەوارەی (ئاوەڵناو)دا ئەدگارێك هەیە بۆ (تەرخانکردن) و دەرگای ئەو ئەدگارە والآیە بەرووی (ناو)دا، وەك:

**پیاوی (تێر)؛ پیاوی (چاوتێر)**

ئەم دەرگایە والآیە دەکەوێتە پێش ئاوەڵناوەکەو پێشوازی دەکات لەهەر وشەیەکی (بەجێ)، بۆ نموونە، ئاوەڵناوی (تێر) تەرخانکراوە بە ناوێکی بەجێ (چاو) و ئاوەڵناوێکیبەرتەسك و تەرخانکراو پەیدابووە لەچەشنی (چاوتێر) و ئەو ئاوەڵناوە تەسکە دەگەڕێتەوە بۆ کەسێك.

- لەبەر رووناکی خاڵی پێشوو، دەتوانین هەندێك لە ئاکارەە ڕێزمانیەکانی (ئاوەڵناوی تەرخانکراو) بخەینەڕوو. بۆ نموونە, لە ئاوەڵناوی (چاوجوان)دا، ئەم سەرنجانە هەن:

**یەکەم**: ئاوەڵناوی پەتی (جوان) لە (جوانی چاو) دەدوێت، وەك (چاوی جوان).

**دووەم**: ئاوەڵناوی تەرخانکراو (چاوجوان)، لە (کەس)ێك دەدوێت کە چاوی جوانە. بۆ نموونە، وتەی (چاو) بریتیە لە بەشێك لە لەش و مەرج نیە ئەو کەسەی کە چاوی جوان بێت، خۆیشی جوان بێت.

**سێیەم**: لەبەر رووناکی ئەو خاڵانەی پێشەوە، گشت کوردیزانێك دەتوانێت دەستەواژەی (چاوی جوان) بەراورد بکات بە دەستەواژەی (چاوجوان). بێگومان، ئەم بەراوردە بریتیە لە کەرستەیەکی کاریگەر بۆ جوداکردنەوەی ئاوەڵناوی بەرتەسکی (چاوجوان) لە ئاوەڵناوی بەرفراوانی (جوان).

- لە ئاستی دەستەواژەی (ناو + ئاوەڵناو)دا ئامرازی بەستن (ی) دەگۆڕێت بۆ ئەلەمۆرفی (ـە)، ئەگەر ناوەکە بکەوێتە بەر زەبری ئامرازی ناساندن (ەکە)، یان ئامرازی ئاماژە، وەك:

**چاو (ی) جوان - چاو (ە) جوانەکە**

**چاو (ی) جوان - ئەو چاو (ە) جوانە**

- هەمان میکانیزمی خاڵی پێشوو، لە ئاستی دەستەواژەی (ناو + ئاوەڵناوی تەرخانکراو)یشدا برەوی هەیە وەك:

**منداڵ (ی) چاو جوان ـ منداڵ (ە) چاو جوانەکە**

یان،

**ئەو منداڵ (ە) چاو جوانە**

- ئاوەڵناو ژوورێکی خۆی هەیە لە قەوارەی (ناو)دا، واتە قەوارەی ئاوەڵناو بچووکترە لە قەوارەی (ناو). لە ئەم بۆچوونەدا، دەبێت ئەوە بزانین کە ئامرازی ناساندن (ەکە) ناچێتەسەر ئاوەڵناوەکە، بەڵکو دەچێتە سەر ناوەکەو دەکەوێتە پاش ئەو ژوورەی کە بۆ قەوارەی ئاوەڵناو تەرخانکراوە.
- نیشانەی نەرێ (نا) بریتیە لە بەشێك لە ڕێزمانی (ئاوەڵناو) و بۆی هەیە ژمارەی هەندێك لە ئاوەڵناوەکان بکات بە (دووبارە). واتە، دەرگای بەشێك لە ئاوەڵناو بەرووی ئامرازی (نا)دا کراوەیە، بۆ دروستکردنی دیوێکی (نەرێ) لە هەمان ئاوەڵناو.
- نیشانەی نەرێ (نە) لە دەرگای (ڕێزمانی کار)ەوە، بەرێگای (ناوی بکەر)ەوە، گەیشتووە بە (ئاوەڵناو). بۆ نموونە، ئاوەڵناوی (نەسووتاو) ئەو توخمانەی تێدا هەیە:

<u>یەکەم</u>: لە کاری (سووتان)ەوە وەرگیراوە.

<u>دووەم</u>: توخمی ئاوەڵناوی تێدا هەیە.

<u>سێیەم</u>: ئاوەڵناوەکە بەزەبری ئامرازی (نە) وەرچەرخاوە بەدیوی نەرێدا.

- بەپێی خاڵی پێشوو، ئاوەڵناوی (ناخۆش) جودایە لە ئاوەڵناوی (نەخۆش) و دەشێت ئاوەڵناوی (نەخۆش) لە دەرگای ڕێزمانی کارێکەوە گەیشتبێت بەڕێزمانی ئاوەلناو، وەك ئاوەڵناوی (نەسووت) لە کاری (سووتان)ەوە.

- دووباره بوونەوەی (ناو)ێك، وەك ناوی (چاڵ) له دەستەواژەی (چاڵ چاڵ)دا، ئاوەڵناوێك دروست دەكات، بەهەمان شێوە دووبارەبوونـەوەی (ئاوەڵناو)ێـك، وەك ئاوەڵنـاوی (جـوان) لەدەسـتەواژەی (جـوان جـوان)دا، ئاوەڵگوزارەیـەك دروست دەكات.
- ئاوەڵنـاو بریتیـه لـه چـینی بنـەڕەت بـۆ (نـاوی واتـایی). كەواتـه، دەتـوانین هەست بكەین، كه (ڕێزمانی ناوی واتایی) بریتیـه لـه رووبـەرێكی بچووكتر له رووبەری گەورەتری (ڕێزمانی ئاوەڵناو).

---

★ گۆڤاری (كاروان)، ژماره (٢٠٥/ ٢٠٠٦).

# بەشی شەشەم

## کەرەستەی ( تر ) لە ڕوانگەی زمانی نووسینەوە

**٦- ١- دەسپێك:**

لەپێناو ئەو مەبەستەدا کە بتوانین زمانی نووسین مشت و ماڵ بکەین و ڕێزمانێکی سفت و پوختی بۆ دابین بکەین، ئەمجارەیان ڕوو دەکەین لە کەرەستەی (...تر)، کە لە دوو بەکارهێناندا دەردەکەوێت. لە بەکارهێنانی یەکەمدا، کەرەستەی (...تر) بریتیە لە مۆرفیمێکی بەند و لە پەرێزی (ئاوەڵناو)دایە و پلەی بەراورد دیاری دەکات. لە ئەم ڕوانگەیەوە، ئەم کەرەستەیە بەجمکی دەکەوێتە کار لەگەڵ کەرەستە (... ترین)، کە دوا پلەی بەراورد دیاری دەکات لە نێو کۆمەڵەیەکدا. لە بەکارهێنانی دووەمدا، کەرەستەی (ـتر) لە پەرێزی ڕێزمانی (ناو)دایە و بریتیە لە مۆرفیمێکی سەربەخۆ و وەك جێناوێك لە ئاستی کەسێکی (ناونەبراو)، یان تشتێکی (ناونەبراو)، بەکار دەهێنرێت. ئەم کەرەستەیەی دوایی، کێشەی زۆرە، چونکە بە چەند ڕوخسارێکی دی جێگرەوەی هەیە، وەك (دی، کە، دیکە، دن). بێگومان، ئێمە لەگەڵ ئەوەداین کە کەرەستەی بەراوردی ئاوەڵناو (... تر) دەستکاری نەکرێت، چونکە ڕێزمانەکەی زۆر پوختە و زۆر گشتیە. لە بەرانبەردا، لە زمانی نووسیندا، حەز دەکەین کە گەمەی (بژارکردن) بخەینە سەر جۆرەکەی تر لە و لە هاوتاکانی و جودای بکەینەوە. لە ئەم ڕووەوە، ئێمە پێشنیار دەکەین کە وشەی (دن) بەکار بهێنرێت لەجیاتی وشەی (تر)، بۆ ئەوەی دوو ڕەگەزی ڕێزمانی هەمان ڕوخساریان نەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا، بەهەنگاوێکی بچووك هەر دوو شێوە زارەکە لەیەکتری نزیك دەبنەوە.

## ٦- ٢- پاشگری بەراوردی ئاوەڵناو (...تر، ...ترین):

لەئاستی پاشگری بەراورد (...تر، ...ترین)دا، چەند خاڵێکی پتەو هەیە، دەشێت تۆمار بکرێن، وەك:

<u>یەکەم</u>: پاشگری بەراورد (تر، ترین) لە پەرێزی ئاوەڵناودایە، نەك لە پەرێزی (ناو)دا، وەك:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| جوان | : | جوانتر | : | جوانترین |
| بەرز | : | بەرزتر | : | بەرزترین |
| نزم | : | نزمتر | : | نزمترین |
| خۆش | : | خۆشتر | : | خۆشترین |
| ڕێك | : | ڕێکتر | : | ڕێکترین |

تەنانەت، ئەگەر ئەم پاشگرە چووە سەر وشەیەکی ئاڵۆز، کە ئاکاری (ناو) و (ئاوەڵناو)ی بەیەکەوە هەڵ گرتبێت، ئەوا دیوە (ئاوەڵناو)ەکەی بەگەن دەکات، نەك دیوە (ناو)ەکەی. لەئەم نموونەیەدا، وشەکانی (پیاو، سەگ، کەر) بەخوازراوی کەوتوون بە دیوی (ئاوەڵناو)دا, وەك:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| پیاو | : | پیاوتر | : | پیاوترین |
| سەگ | : | سەگتر | : | سەگترین |
| کەر | : | کەرتر | : | کەرترین |

<u>دووەم</u>: وەك پاشگری (...تر، ...ترین) لە پەرێزی ئاوەڵناودایە، گشت جۆرەکانی (ئاوەڵناو) سەودا دەکات. واتە، مەرج نیە هەر ئاوەڵناوی سادە وەربگرێت، دەشێت ئاوەڵناوی ناسادە وەربگرێت، وەك:

| | | |
|---|---|---|
| ناخۆش | : ناخۆشتر | : ناخۆشترین |
| بەهێز | : بەهێزتر | : بەهێزترین |
| بەهەڵپە | : بەهەڵپەتر | : بەهەڵپەترین |
| ناودار | : ناودارتر | : ناودارترین |
| خۆگر | : خۆگرتر | : خۆگرترین |
| چاوتیژ | : چاوتیژتر | : چاوتیژترین |
| دەمشڕ | : دەمشڕتر | : دەمشڕترین |
| ماڵ وێرانکەر: | ماڵ وێرانکەرتر | : ماڵ وێرانکەرترین |

تەنانەت، ئەم پاشگرە دەچێتە سەر ئاوەڵناوی وشەی جووتەك، وەك:

| | | |
|---|---|---|
| ڕێك و پێك | : ڕێك و پێكتر | : ڕێك و پێكترین |
| شۆخ و شەنگ | : شۆخ و شەنگتر | : شۆخ و شەنگترین |
| شل و مل | : شل و ملتر | : شل و ملترین |
| سارد و سڕ | : سارد و سڕتر | : سارد و سڕترین |

سێیەم: پاشگری بەراوردی ئاوەڵناو (...تر، ...ترین)، بریتیە لە ڕەگەزێکی ڕێزمانی (بەند) و بە هیچ جۆرێك ناشێت جودا بکرێتەوە لە ئاوەڵناوەکەی، وەك:

جوان تر : (دروست نیە)

جوانتر : (دروستە)

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم مۆرفیمە واتاکەی دەپووکێتەوە، ئەگەر بە جودایی گۆ بکرێت، یان بنووسرێت. هەر لەبەر ئەوە، سیمای (بەندایەتی) زاڵە بەسەریدا.

**چوارەم:** زاراوەی (پاشگر) بریتیە لە زاراوەیەکی (بەجێ) بۆ ئەم ڕەگەزە ڕێزمانیە، چونکە دەلکێت بە کلکی ئاوەڵناوەوە و ئەگەر لە ئەو جێیە بترازێت، ئەوا ڕوودەکات لە (ناڕێزمان).

**پێنجەم:** پاشگری (...تر) سیمای (گشتایەتی) هەڵ دەگرێت، لە پەرێزی ئاوەڵناودا. بە هەمان، شێوە پاشگری (...ترین)، بەگشتی، پەیوەستە بە پاشگری (...تر)ەوە. هەر لەبەر ئەو هۆیە، ئەو ئاوەڵناوەی کە پلەی بەراورد پەسەند بکات و پاشگری (...تر) وەربگرێت، دەبێت پاشگری (...ترین)یش وەربگرێت. یان، هەر وشەیەك کە پسوولەی ئاوەڵناوی هەبێت دەبێت هەر دوو پاشگری (...تر) و (...ترین) بەیەکسانی وەربگرێت.

**شەشەم:** لە ڕووی قەوارەی ڕێزمانیەوە، دەشێت پاشگری بەراورد (...تر، ...ترین) بە قەوارەیەکی پتەو بناسین و لە ئەو قەوارەیەدا خانەیەکی بۆش هەبێت بۆ هەر ئاوەڵناوێك، وەك:

| | |
|---|---|
| (ئاوەڵناو) | ....تر |
| | ...ترین |

**حەوتەم:** پاشگری بەراورد (...تر، ...ترین)، دەتوانێت ئەو ئاوەڵناوانە وەربگرێت کە بە پاشگرێکی دن بچووکتر کرابێتنەوە. بۆ نموونە، ئاوەڵناوی (جوان) پاشگری (...کیلە) وەردەگرێت، دەبێت بە (جوانلیکە)، ئەم ئاوەڵناوەش بۆی هەیە پاشگری بەراورد وەربگرێت، بەڵام لەپاش پاشگری بچووك کردنەوە، وەك:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| جوانکیلە | : | جوانکیلەتر | : | جوانکیلەترین |
| نەرمۆڵە : | : | نەرمۆڵەتر | : | نەرمۆڵەترین |
| پانۆڵە | : | پانۆڵەتر | : | پانۆڵەترین |

**هەشتەم:** پاشگری ئاوەڵناو نە روخساری دەگۆڕێت و نە جێگرەوەی هەیە. هەر لەبەر ئـەوە، لەگشـت جێیەکـدا بەروخسـاری (...تـر، ...تـرین) گـۆ دەکرێـت و رێنـووس دەکرێت.

**نۆیەم:** پاشگری (...ترین) لە سەر باتلۆی پاشگری (...تر) رۆنراوە و گشت ئاکارەکانی هـەڵ دەگرێـت، سـەرەڕای تـوخمێکی سـەربار, کـە نیشـانەی (یـن) دەی خاتـە سـەر پاشگری (...تر) و دەی کات بە (...ترین).

## ٦- ٣- کەرەستەی (تر، دی، کە, دیکە، دن):

لەئاستی کەرەستەی (تر، دی، دیکە...)دا، چەند سەرنجێك هەیە، وەك:

**یەکەم:** هەرچەند کەرەستەی (تر) برەوەی زۆرتربێـت، بـەڵام چـەند جێگرەوەیـەکی هەیەـکەواتە، پەرپووتیـەك لەئارادا هەیـە و دەشـێت یـەکلایی بکرێتـەوە، لـە زمـانی نووسیندا. وەك:

کەسێکی (تر): کەسێکی (دی): کەسێکی (کە):

کەسێکی (دیکە): کەسێکی (دن)

**دووەم:** کەرەستەی (تر) و هاوتاکانی بەراستەوخۆیی لە پەراوێزی (ڕێزمانی ناو)دان. بـۆ نموونـە، وشـەی (کـەس) لـە خـاڵی پێشـوودا، کـەوتووە بـە دیـوی (نـاو)دا، نـەك (ئاوەڵناو).

**سێیەم:** کەرەستەی (تر) و هاوتاکانی بەهیچ جۆرێك بریتی نین لە (مۆرفیمی بەند)، چـونکە ئـامرازی خستنەسـەری (ی) وەردەگـرن و ئـەو ئـامرازە ئـەو (نـاو)ە جـودا دەکاتەوە، کە دەچێتە سەری، وەك:

(کەسێك : ی : تر), (ساڵێك : ی : تر)

(ئەو : ی : تر), (ئەوە : ی : تر)

**چوارەم:** وەك بەرەنجامێك بۆ خاڵی پێشوو، كەرەستەی (تر) بریتیە لە وشەیەكی قەوارەدار و قەوارەكەی ناچێتە پاڵ قەوارەی (ناو)، مەگەر بە ڕێزمانی ئامرازی خستنەسەری (ی)، نەخشەی (٦- ١).

| قـــــــەوارەی كۆمـــــــەڵـــــــەی(نـــــــاو) | | |
|---|---|---|
| (ناو) | ی | ( تر ) |
| ناو لە كۆمـــەڵەی نـــــــاودا | قـــــــەوارەی ئامرازی (ی) | قەوارەی ئاوەڵناو |

نەخشەی (٦- ١): پاشگری (...تر) لە قەوارەی (ناو)دا.

**پێنجەم:** كەرەستەی (تر)، ڕوخساری ئاوێتەی هەیە، وەك:

ئیتر : ئیدی
هیتر : هیدی
یەكتر : یەكدی

لەئـەم نموونانـەدا، وشـەی (ئـیتر) بریتیـە قـەوارەی كەرەسـتەی (...ی تـر)، لـەپاش فرێدانی (ناو). بەڵام وشەی (هـیتر)، بریتیـە لـە (هـی : ی : تـر) لـە پـاش ئاوێتـە بووونی دوو دەنگی (ی).

**شەشەم:** كەرەستەی (تر) و هاوتاكانی بۆیان هەیە بچنە سەر ناوێك كـە بـە ئـامرازی (مكە) كرابێت بە (ناسراو)، وەك:

كەس (مكە) : ی : تر
ئەوە (مكە) : ی : تر
ساڵ (مكە) : ی : تر

### ٦- ٤- لەئاستی زمانی نووسیندا:

لەروانگەی زمانی نووسینەوە، پاشگری بەراوردی ئاوەڵناو (...تر، ...ترین) شایستەی ئەوەیە کە پتەو بکرێت، چونکە گشتییەو روخسارێکی رەبەقی هەیە. لەهەمان کاتدا، هیچ جێگرەوەیەکی نیە بە وشەی ترو ئەرکی پلەی بەراوردی ئاوەڵناو دیاری دەکات. لەئاستی کەرەستەی (تر)دا، هەندێك کێشە هەیەو ئەو کێشانەش وا دەکەن کە لە رەونەقی کەم بکەنەوە، وەك:

<u>یەکەم</u>: لەزمانی نووسیندا، چەند جێگرەوەیەکی هەیە لە چەشنی (دی، کە، دیکە،...).

<u>دووەم</u>: لە کرمانجی ژووروودا وشەی (دن) بەکار دەهێنرێت، بەرانبەر بە وشەکانی (دی، کە، دیکە، تر).

<u>سێیەم</u>: وشەی (تر) بەربلاوترە لە بەکارهێناندا، بەڵام بەروخسار دەچێتەوە سەر پاشگری بەراوردی ئاوەڵناو (...تر).

بەرانبەر بە ئەم کێشانە و بۆ جودا کردنەوەی لە پاشگری بەراورد، دەشێت یەکێك لە جێگرەوەکانی وشەی (تر) بخەینە بەربرەو، وەك (دی، کە، دیکە، دن، ...). سەبارەت بە ڕای ئێمە، ئێمە وشەی (دن) بە شیاو دەزانین، وەك:

کەسێکی (تر) : کەسێکی (دن)

کەسەکەی (تر) : کەسەکەی (دن)

کەسانی (تر) : کەسانی (دن)

کەسانێکی (تر) : کەسانێکی (دن)

کەسەکانی (تر) : کەسەکانی (دن)

ئەم متوربەکردنە دەرگایەك دەکاتەوە، چونکە دەشێت وشەی (تر)، کە بە جودایی ڕێنووس بکرێت، هەر بە کۆمپیوتەر بژار بکرێت و ڕاستەوخۆ بکرێت بە (دن). بەهەمان شێواز، گشت هاوتاکانی وەك (دی، دیکە، کە، ...) دەشێت بژار بکرێن.

## ٦- ٥- پوختەکاری:

- لە زمانی نووسیندا، وشەی (تر) دوو بەکارهێنانی هەیە، وەك:

  یەکەم: پاشگری بەراورد لە ڕێزمانی ئاوەڵناودا، وەك:

  (جوان، جوانتر، جوانترین)

  دووەم: کەرەستەی (تر) لەڕێزمانی (ناو)دا، وەك:

  (بەردێکی تر، بەردەکەی تر، ...)

- پاشگری بەراورد (...تر) لە پلەی بەراوردکاریدا دەبێت بە (...ترین) و سیمای بەکارهێنانی گشتی هەڵ دەگرێت لە پەرێزی (ئاوەڵناو)دا.
- کەرەستەی (تر) لە پەرێزی (ناو)دایە، نەك (ئاوەڵناو) و بە ئامرازی (خستنە سەری)، دەچێتە سەر (ناو).
- کەرەستەی (تر)، وەك ناوێك هەڵ دەسووڕێت، بەڵام چەند جێگرەوەی هەیە وەك (دی، کە، دیکە، دن، ..). ئەم کەرەستانە وا دەکەن کە ڕێزمانەکەی پەرپووت ببێت. هەر لەبەر ئەوە، دەشێت یەکێك لە ئەو ڕوخسارانە بەگەن بکرێت و بکرێت بە گۆڵی زمانی نووسین.

---------------

٭ گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٢٠/٢٠٠٦).

# بەشی هەفتەم
# ڕێزمانی ناو و لاڕێزمانی ئاوەڵناو
# لە تەرازووی بەراوددا

## ٧- ١- دەستپێك:

لە ئاخاوتنی کوردیدا، کەرەستەی (ئاوەڵناو) و کەرەستەی (ناو) ڕێزمانی تایبەتی خۆیان هەیە و هەرناوها بە سووك و ئاسان بە ڕێزمانی زمانانی تر لێك نادرێنەوە. لەراستیدا، ڕەنگە ڕێزمانی ئەو بابەتانە، لە ئەو زمانانەدا، بتوانێت بارە گشتیەکە پیشان بدات، بەڵام بارە تایبەتییەکە دەمێنێتەوە بۆ ئێمە، کە یەکلایی بکەینەوە و مۆرك و ماکی دەربخەین. هەر لەبەر ئەوە، بە هوردی دەستمان خستووەتە نێو بابەتەکە و کەڵکی ڕاستەوخۆ و ناراستەوخۆمان لە هەندێك سەرچاوە دەرهێناوە و لەگەڵ بیرو بۆچوونەکانی خۆماندا کردوومانە بە ئەم نووسینە. بە ئەو هیوایەی کە خوێنەری ئازیز لێمان تێ بگات و بتوانێت دیوە تیۆرییەکەی (ڕێزمانی ئاوەڵناو) هەرس بکات. ئەوەش لەیاد نەکەین، کە بابەتەکە سنووربەزێنەو قاوغ شکێنە و پەی دەبات بە هەندێك کونج و کەلێن، کە هێشتا ڕووناکی ڕێزمانی کوردی پێ نەگەیشتووە.

## ٧- ٢- ئاوەڵناو و پلەی بەراورد:

بەشێوەیەکی جیاواز لە بابەتی (ناو)، بابەتی (ئاوەڵناو) کەرەستەی بەراورد (...تر، ...ترین) پەسند دەکات، وەك:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| نیان | : | نیانتر | : | نیانترین |
| گەش | : | گەشتر | : | گەشترین |
| ڕوون | : | ڕوونتر | : | ڕوونترین |

بەرانبەر بە ئەم نموونانە، بابەتی (ناو) بە هیچ جۆرێك پلەی بەراورد پەسەند ناكات. تەنانەت، ئەگەر ناوێك پلەی بەراوردی پەسەند كرد، ئەوا ئەو ناوە كەوتووە بە دیوی (ئاوەڵناو)دا. بۆ نموونە، وشەی (پیاو) دیوی (ناو) و دیوی (ئاوەڵناو)ی هەیە، بەڵام ئەگەر گوترا:

پیاو : پیاوتر : پیاوترین

ئەوا، وشەی (پیاو) لە پەرێزی (ئاوەڵناو) دایە. كەواتە، تەنها و تەنها مزاری (ئاوەڵناو) پلەی بەراورد پەسەند دەكات, چونكە دەشێت كەرەستەی (...تر، ...ترین) بكرێت بە سەنگی مەحەك بۆ ناسینەوەی زێڕی (ئاوەڵناو) لەئاستی هەر وشەیەكدا، یان لەئاستی دیوی ئاوەڵناوی هەر وشەیەكی (دوولایەنە)دا، وەك نموونەی (پیاو)، كە لەسەرەوە راڤەكراوە.

## ٧- ٣- ئاوەڵناو و ناوی واتایی:

وەك (ئاوەڵناو) پلەی بەراورد پەسەند دەكات و خۆی جودا دەكاتەوە لە (ناو)، جارێكی تر دەتوانێت ئامرازی (ی) وەربگرێت و ببێت بە (ناوی واتایی)، وەك:

نیان : نیانی

گەش گەشی

روون : روونی

بەرانبەر بەئەم نموونانە، ئەگەر (ناو)ێك ئامرازی (ی) وەربگرێت، ئەوا ئاوەڵناوی جێگەیی پەیدا دەبێت، وەك:

شاخ : شاخی

كویستان: كویستانی

شار : شاری

کەواتە، (ئاوەڵناو) جودا دەبێتەوە لە (ناو) بە چێ کردنی (ناوی واتایی)، لەجیاتی (ئاوەڵناوی جێگەیی).

### ٧- ٤- ئاوەڵناو و ئامرازی ناسراوی (ەکە):

لە ئاخاوتنی کوردیدا، ئامرازی ناساندن (ەکە) بۆی هەیە بچێتە سەر (ناو) و بۆی هەیە بچێتە سەر (ئاوەڵناو)، وەك:

**یەکەم:** دەستەواژەی (ناو):

| | | |
|---|---|---|
| شاخ | : | شاخـ (ـەکە) |
| ئاو | : | ئاو (ەکە) |
| شار | : | شارە (ەکە) |

**دووەم:** دەستەواژەی (ئاوەڵناو):

| | | |
|---|---|---|
| جوان | : | جوان (ـەکە) |
| خۆش | : | خۆشـ (ـەکە) |
| بچووك | : | بچووکـ (ـەکە) |

لەرووی بەراوردەوە، دەستەواژەی (ناو) ئامرازی ناساندن (ەکە) بەرنادات بە (واتا) چونکە هی خۆیەتی، بەڵام دەستەواژەی (ئاوەڵناو) بەری دەدات و دەی داتەوە بە (ناو)، چونکە هی خۆی نیە, وەك:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| شاخی جوان | : | شاخە جوانـ (ەکە) | : | شاخـ (...)ەکە |
| ئاوی خۆش | : | ئاوە خۆشـ (ەکە) | : | ئاو (...) ەکە |
| شاری بچووك | : | شارە بچووکـ (ەکە) | : | شار (...) ەکە |

کەواتـە، ئـامرازی (ەکـە) لـە پـەرێزی (نـاو) دایـە، نـەك لـە هـی ئاوەڵنـاودا. بەواتایەکی تر، ئاوەڵناوەکانی (جوان، خۆش، بچووك) بەشـێوەیەکی کاتی ئـامرازی (ەکە) یان وەرگرتووە، بەڵام ناوەکانی (شاخ، ئاو، شار) بەشێوەیەکی بنەڕەتی ئامرازی (ەکە) یان وەرگرتووە. کەواتە، ئاوەڵناو بۆی نیە ئامرازی ناسـاندن (ەکـە) وەربگرێـت و ئەگەر وەری گرت، وەك نموونەی (جوانەکە)، ئەوا هی خۆی نیە و دەگەڕێتەوە بـۆ وشـەی (شـاخ). هـۆی ئەمـەش لـە ئـەو راسـتیەدایە، کـە رێزمانەکـە رێ دەدات، نـاوی (شـاخ) لابچـێت لـە دەسـتەواژەی (شـاخە جوانەکـە)دا و ببێـت بـە (...جوانەکـە) و ئامرازەکەیشی (ەکە) بەجێ بمێنێت لەسەر ئاوەڵنـاوی (جـوان)، چـونکە دەگەڕێتـەوە بۆ هەمان ناوی لابـراو (شـاخ). هـەر بـۆ نموونـە، هـەردوو دەسـتەواژەی (شـاخەکە) و (شـاخە جوانەکـە) پتـەون، بـەڵام دەسـتەواژەی (جوانەکـە) پتـەو نیـە و کلۆرییـەکی تێدایە، کە بە بابەتی (ناو) پڕدەکرێتەوە.

### ٧- ٥- قەوارەی (ناو) و قەوارەی (ئاوەڵناو):

هەردوو ئامرازی (ەکە) و (ێك) لە پەرێزی (ناو)دان و هیچ پەیوەندییـەکی راستەوخۆیان نیە بە پەرێزی (ئاوەڵناو)ەوە. واتە، ئەو دوو ئامرازە هی دەسـتەواژەی (نـاو)ن، نـەك هـی (ئاوەڵنـاو). واتـە, دەشـێت ئـەو دوو ئـامرازە بکـرێن بـە سـەنگی مەحـەك بـۆ ناسـینەوەی (ئاوەڵنـاو). بـۆ نموونـە، ئەگـەر گـوترا (...زەردەکـە)، ئـەوا ئـامرازی (ەکـە) لەرەسـەندا دەگەڕێتـەوە بـۆ نـاوی (کـراس)، وەك (کراسـەکە) و لـە پاشـتردا بـووە بـە (کراسـەزەردەکە)، ئـەمجار رێزمانەکـە رێـی داوە کـە ببێـت بـە (...زەردەکە). بەهەمان شێواز، ئـامرازی (ێـك) بـۆی هەیـە بپەڕێتـە سـەر (ئاوەڵنـاو) بەڵام بەشێوەیەکی کاتی, چونکە هی خۆی نیە, وەك:

زەردەکە هەڵ بگرە

زەردێك هەڵ بگرە

بە واتای:

کراسە زەردەکە هەڵ بگرە

کراسێکی زەرد هەڵ بگرە

کەواتە، لەهەر جێیەکدا، کە (ئاوەڵناو)ێک ئامرازی ناسراوی (ەکە) و ئامرازی نەناسراوی (ێک) وەربگرێت، ئەوا بەئاسانی فڕێی دەداتەوە بۆخاوەنەکەی، کە بریتیە لە (ناو)، بەڵام ئەگەر (ناو)ێک وەریان بگرێت، ئەوا بەریان نادات، چونکە هی خۆیەتی و هی (ئاوەڵناو) نیە. بۆ نموونە، ئەگەر گوترا (پیاوە پیاوەکە)، ئەوا وشەی یەکەم (پیاو) بریتیە لە (ناو) و وشەی دووەم (پیاو) بریتیە لە (ئاوەڵناو). یان، ئەگەر گوترا (پیاوەکە)، ئەوا دوو باری شیاو هەیە. یەکەمیان، ئەگەر دەستەواژەکە دەست بدات کە بکرێت بە (پیاوە پیاوەکە)، ئەوا وشەی (پیاو) لە دەستەواژەی (...پیاوەکە)دا بریتیە لە (ئاوەڵناو). دووەمیان، ئەگەر دەستەواژەکە دەست نەدات کە بکرێت بە (پیاوە پیاوەکە)، ئەوا وشەی (پیاو) لە دەستەواژەی (پیاوەکە)دا بریتیە لە (ناو)، نەك (ئاوەڵناو). بەپێی ئەوەی گوترا، قەوارەی (ناو) بریتیە لە قەوارەیەکی سەربەخۆ، بەڵام قەوارەی (ئاوەڵناو) هەر چەند سەربەخۆ بێت، بەڵام بنسترەکەی، یان بناغەکەی، بریتیە لە قەوارەی (ناو). واتە، قەوارەی (ئاوەڵناو) هیچ واتایەك نابەخشێت، ئەگەر قەوارەی (ناو) نەبووبێت بە بناغەکەی. بەکورتی و بە کوردی، ئەگەر پرسیارێك بکرێت، وەك:

ئایا (ناو) لە (ئاەوڵناو)ە؟ یان (ئاوەڵناو) لە (ناو)؟

لە وەڵامدا دەڵێین، قەوارەی ناو بریتیە لە چینی بنەڕەت و قەوارەی (ئاوەڵناو) بریتیە لە چینێکی (ڕۆنراو) لەسەر چینی بنەڕەت (ناو). کەواتە،

(ئاوەڵناو) لە (ناو)ە، نەك (ناو) لە (ئاوەڵناو). لەئەم هەڵوێستەدا، دەتوانین نیگارێك دروست بکەین بۆ هەردوو قەوارەی (ناو) و (ئاوەڵناو)، نەخشەی (٧- ١).




نەخشەی (٧- ١): قەوارەی ناو و قەوارەی ئاوەڵناو.

کەواتە، قەوارەی (ناو) گەورەیە و بنەڕەتە و قەوارەی (ئاوەڵناو)یش بچووکترە و بریتیە لە (چین)ێك لەسەر قەوارەی (ناو)، یان لە (خانەیەك) لە قەوارەی دەستەواژەی (ناو)دا.

## ٧- ٦- ئاوەڵناو و ڕستەسازی:

بەپێی ئەوەی کە (ئاوەڵناو) هیچ قەوارەیەکی سەربەخۆی نیە و گشت کاتێك قەوارەکەی بریتیە لە (ژوور)ێك لە قەوارەی (ناو)دا، کەرەستەی (ئاوەڵناو) بۆی نیە کە:

- ئامرازی ناسراوی (ەکە) وەربگرێت بە ڕاستەوخۆیی، مەگەر بەقەرز لە قەوارەی ئەو (ناو)ەوە کە بۆی دەگەڕێتەوە.
- بەهەمان شێواز، ئامرازی نەناسراوی (ێك) وەرناگرێت و ئەگەر وەری بگرێت، ئەوا بە قەرز وەری گرتووە لە ئەو (ناو)ەوە کە بۆی دەگەڕێتەوە.

سەرەڕای ئەو دوو ئاکارە، بابەتی (ئاوەڵناو) ناتوانێت ببێت بە (بکەر) یان بە (بەرکار)، یان بە (بەرکاری ناراستەوخۆ) لە قەوارەی ڕستەدا.

سەبارەت بە نموونە، لە ڕستەیەکدا، وەك:

(جوانەکە) هەڵ بگرە

بەرکاری (...جوانەکە)، دەگەڕێتەوە بۆ (ناو)ێك، وەك:

(کراسە جوانەکە) هەڵ بگرە

یان، ئەگەر گوترا:

(...جوانەکە) دڕاوە

بکەری (...جوانەکە) دەگەڕێتەوە بۆ (ناو)ێك، وەك:

(کراسە جوانەکە) دڕاوە

یان، ئەگەر گوترا،

دەست بۆ (...جوانەکە) درێژ بکە

بەرکاری (ناراستەوخۆ)ی (...جوانەکە) دەگەڕێتەوە بۆ (ناو)ێك، وەك:

دەست بۆ (کراسە جوانەکە) درێژ بکە

کەواتە، (ئاوەڵناو) بۆی نیە لە ڕژێمی ڕستەدا ڕۆڵی هەبێت، مەگەر بەتەواوکەری (ناو) و ئەو ناوەیش بۆی هەیە کە ببێت بە کۆلکەکانی ڕستەسازی، وەك (بکەر، بەرکار، بەرکاری ناراستەوخۆ).

## ٧- ٧- چەند نموونەیەکی سەیر:

لە نموونەیەکدا، وەك:

جوان نەهاتووە

ئاوەڵناوی (جوان) ڕەگەزنامەی خۆی گۆڕیوە و بووە بە (ناوی کەسان) هەر لەبەر ئەو هۆیەیە، کە لە ئەو ڕستەیەدا توانیوەتی ببێت بە (بکەر). بەهەمان شێواز، ئەگەر گوترا: من جوان (م) بینیوە

ئەوا، ناوی کەسێك بووە بە (بەرکار)، نەك ئاوەڵناوی (جوان). هەر لەبەر ئەوە، ئەگەر ئاکاری (ئاوەڵناو) بپارێزین لە وشەی (جوان)دا، ئەوا دەبێت بڵێین:

جوانەکە نەهاتووە

من جوانەکەم بینیوە

یان:

جوانێك نەهاتووە

من جوانێکم بینیوە

لە ئەم نموونانەدا، ڕاستە وشەی (جوان) ئاوەڵناوە و بووە بە (بکەر) و بووە (بەرکار)، بەڵام (ناو)ێك کەوتووەتەژێر لێوەوە، کە واتاکەی ئاشکرایە، وەك:

(...جوانەکە) نەهاتووە : (منداڵە جوانەکە) نەهاتووە

من (.....جوانێك)م بینیوە : من (منداڵێکی جوان)م بینیوە

کەواتە، زناکەکانی ئامرازی (ەکە) و ئامرازی (ێك) لە سەر وشەی (جوان) لە بۆ ئەوەیە کە ئاکاری (ئاوەڵناو) بپارێزرێت لە وشەی (جوان)دا. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو دوو ئامرازە هی (ناو)ن و (ناو)ەکە دای ناوە لەسەر وشەی (جوان) بۆ ئەوەی لە پەردەی بیردا واتای ئاوەڵناوی (جوان) نەگۆڕێت بە واتای ناوی (جوان)، چونکە ڕۆڵە سنتاکسیەکە دەی گۆڕێت بە (ناو)، وەك:

جوان (...) نە هاتووە

جوانـ (ەکە) نە هاتووە

لەرستەی یەکەمدا، وشەی (جوان) بووە بە (ناوی کەسان) و لە ڕۆڵی (بکەر)دایە. لە نموونەی دووەمدا ناوەکە هێمای (ەکە)ی لەسەر ئاوەڵناوی (جوان)

داناوە, بۆ ئەوەی هەم (ئاوەڵناو) بێت، هەم لەجێی (بکەر) بێت، هەم هەڵ نەپلێت بە دیوی (ناو)دا.

## ٧- ٨ - ئاوەڵناو و ئامرازی خستنەسەری (ی):

لە دوو نموونەدا، وەك:

گوڵ (ی) گەش

گوڵ (ی) باغ

ئامرازی (ی) بەکارهێنراوە جارێك لەنێوان ناوی (گوڵ) و ئاوەڵناوی (گەش)دا جارێکی تریش لە نێوان ناوی (گوڵ) و ناوی (باخ)دا. لە راستیدا، هەردوو ئامرازی (ی) لەئەو دوو بەکارهێنانەدا زۆر جیاوازن لەیەکتری، چونکە لە یەکەمدا لە نێوان (ناو) و (ئاوەڵناو) دایە و لە دووەمدا، لە نێوان (ناو) و (ناو) دایە. بۆ سەلماندنی ئەم راستیە، دەتوانین ئامرازی (ەکە) بەکاربهێنین. لەئاستی نموونەی یەکەمدا دەگوترێت:

[گوڵـ (ـە) گەشـ]ەکە

بەڵام، لەئاستی نموونەی دووەمدا، سێ باری شیاوی تر هەیە وەك:

گوڵ (ـەکە) (ی) باخ

گوڵ (ـەکە) (ی) باخـ (ـەکە)

گوڵ (ی) باخـ (ـەکە)

لەدەستەواژەی یەکەمدا، چونکە هەر یەك (ناو) هەیە، یەك (جار) ئامرازی (ەکە) بەکارهێنراوە و ئەو ئامرازە ئامرازی (ی) گۆڕیوە بۆ (ـە). لەبەرانبەردا، لەبەر ئەوەی دوو (ناو) هەیە لە نموونەی دووەمدا، سێ باری شیاوی تر دەرکەوتووە، بەڵام ئامرازی (ی) نەگۆڕاوە بۆ (ی). کەواتە، جیاوازی دەرکەوتووە و ئەو ئامرازەی

خستنەسەر (ی)، کە (ئاوەڵناو) بار دەکات لە (ناو)، جیاوازە لە ئامرازی (ی) لە نێوان دوو (ناو)دا. بەئەم شێوازە، دەشێت ئامرازی (ی) و ئەلەمۆرفەکەی (ـە) بکرێت بە سەنگی مەحەك بۆ ناسینەوەی ماکی (ئاوەڵناو) و بۆ دابڕینی پەرێزی (ئاوەڵناو) لە پەرێزی (ناو).

## ٧- ٩- پوختەکاری:

- قەوارەی (ئاوەڵناو) هەرچەند سەربەخۆ بێت و ڕێزمانی تایبەتی خۆی هەبێت، بەڵام بە ڕێزمان، هەر لەپەرێزی ڕێزمانی (ناو)دا بەندە.
- کەواتە، (ئاوەڵناو) لە (ناو)ە، نەك (ناو) لە (ئاوەڵناو). واتە، هەر (ئاوەڵناو)ێك دەشێت و دەبێت بگەڕێتەوە بۆ سەر (ناو)ێك، لە بەکارهێناندا.
- ئاوەڵناو پلەی بەراوردی هەیە بە کەرەستەی (...تر، ...ترین)، بەڵام (ناو) ئەو کەرەستانەی نیە و پەسندی ناکات.
- ئاوەڵناو بە ئامرازی (ی) دەبێت بە (ناوی واتایی) بەڵام (ناو) بە ئامرازی (ی) دەبێت بە جۆرێك لە (ئاوەڵناو)، بە ڕادەی ئەو ناوە.
- کەرەستەی ناسراوی (ەکە) و کەرەستەی نەناسراوی (ێك) دەگەڕێنەوە بۆ سەر (ناو)، نەك (ئاوەڵناو). کەواتە، لەهەر جێیەك کە ئەو دوو ئامرازە دەربکەون بە (ئاوەڵناو)ەوە، ئەوا بە قەرز وەرگیراون و دەشێت بگەڕێنرێنەوە بۆ سەر (ناو)ێك.
- ئاوەڵناو بۆی نیە ببێت بە کۆلکەیەکی ڕستە، وەك (بکەر، بەرکار، بەرکاری ناراستەوخۆ)، بەڵام (ناو) بۆی هەیە. واتە، (ئاوەڵناو) هەر لە ئەلبوومی وشەسازیدایە، نەك ڕستەسازی. بەواتایەکی تر، ئەگەر لە گەمەیەکی ڕستەسازییانەدا (ئاوەڵناو) دەرکەوت، ئەوا ئەو ئاوەڵناوە هیچ ڕۆڵێکی ڕستەسازییانەی نیە. یان ئەگەر ئەو ڕۆڵەی هەبوو، ئەوا یان، لەجێی (ناو)ێك کرتاو دەرکەوتووە، یان ناسنامەی (ناو)ی وەرگرتووە.

- لەرستەیەکدا، وەك (جوانەکە هەڵ بگرە)، ئاوەڵناوی (جوانەکە) وەك (بەرکار) دەرکەوتووە، بەڵام بەرکاری ڕەسەن بڕیتیە لە ناوێك (کراسەکە)، یان (کراسە جوانەکە). کەواتە، دەستەواژەی (کراسەکە)، ئامرازی (ەکە)ی بۆ شایەتی بەجێ هێشتووە لەسەر (جوانەکە) بۆ ئەوەی هەڵ نەپلێت بە دیوی (ناو)دا و بۆ ئەوەی دەری بخات، کە سەربەخۆ نیە لە (ناو)ێك، کە بڕیتیە لە (کراسەکە).
- ئامرازی خستنەسەر (ی) لە نێوان (ناو) و (ئاوەڵناو)دا یەکسان نیە بە هەمان ئامراز لە نێوان (ناو) و (ناو)دا. بە واتایەکی تر، ئامرازی (ی) لەپێش (ئاوەڵناو)دا دەگۆڕێت بە (ە)، ئەگەر ناوەکە بناسێنرێت بە ئامرازی (ەکە)، یان بە ئامرازی ئاماژە، وەك (ئەو گوڵە گەشە).

★ گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٤١/ ٢٠٠٨).

# بەشی هەشتەم
# پانۆرامایەك بۆ ڕێزمانی ئاوەڵناو لە ئاخاوتنی کوردیدا

**٨- ١-دەستپێك:**

بابەتی ئاوەڵناو بریتیە لە یەکێك لە بەشەکانی ئاخاوتن‌و خۆی جودا دەکاتەوە، چی لە ڕەگەزی(ناو)و چی لە بەشەکانی تری ئاخاوتن. بێگومان بابەتی (ئاوەڵناو) هێندە گرنگ نیە وەك بابەتی (ناو)و بابەتی (کار)، بەڵام هەر گرنگی خۆی هەیە، چونکە پەرێزی خۆی هەیە لە ڕێزماندا، چی لەڕووی وشەسازییەوەو چی لەڕووی واتاسازییەوەو چی وەك تەواوکەری (ناو) لە ڕستەسازیدا. ئەمەو لە ئاستی ڕێزمانی(ئاوەڵناو)دا ئاڵۆزییەکی یەکجار زۆر هەیەو لە هەندێك جێدا، ناتوانرێت بە ئاسانی بناسرێتەوە، چونکە لەگەڵ بەشە ئاخاوتنەکانی تردا تێکەڵ دەبێت. لە ئەم نووسینەدا نزیکەی (١٠) دە ئەندازە بەکارهێنراوە و کراون بەسەنگی مەحەك بۆ ناسینەوەی مژاری(ئاوەڵناو)و پاوانکردنی لە ڕووبەری بەشە ئاخاوتنی خۆیدا. لە ئەم ڕووەوە، گەزاف ئەو دە ئەندازەیە بەکارهێنراوە، چی بۆ جوداکردنەوەی (ناو)و (ئاوەڵناو)و چی بۆ دۆزینەوەی توخمی(ئاوەڵناو) لە هەندێك وشەی تەمومژداردا. لەلایەکی ترەوە، ئێمە ویستوومانە بابەتی (ئاوەڵناو) سەنگینترو ڕەنگینتر بکەین بەرێزمانە ڕەسەنەکەی خۆی‌و لە تەرازووی ڕێزمانی کوریدا ماك‌و مۆرکی دەربخەین، واتە تێ بکۆشین‌و نەهێڵێن چەمکی (ئاوەڵناو) بێ شکۆ بێت‌و بە بەشە ئاخاوتنێکی لاوەکی دابنرێت، وەك هەندێك لە مامۆستایانی زمانی ئینگلیزی، بە برشتی ڕێزمانی ئینگلیزی ئەسپی خۆیان تاوداوە لە ڕێزمانی (ئاوەڵناو)دا. بێگومان، دەبێت زمانی کوردی بزانین بە (ڕێزمان) نەك بەزمانی شیری، ئەوسا ڕێزمانی (ئاوەڵناو) بەراوردبکەین بە زمانانی تر. لە کۆپلەی (چەند ڕاستیەك لە ڕێزمانی ئاوەڵناودا)، چەند دیاردەیەك خراونەتە ڕوو، کە زۆر بە دەگمەن

هەستیان پێکراوە لە ڕێزمانی کوردیدا. لە ڕاستیدا، ئەو دیاردانە بریتین لە زەمینەی ڕێزمانی ئاوەڵناو و ئەوانەی کە دەیانەوێت لەسەر (ئاوەڵناو) بنووسن، دەبێت لە یەکەم هەنگاودا ئەو مۆرکانەیان هەرس بکەن بەرێزمان، ئەوسا هەنگاو بکەنەوە لە ڕێزمانی ئاوەڵناوی کوردیدا. بەواتایەکی تر، زۆر نارێکەو زۆر ناسازە کە بەرێزمانی زمانێکی تر بیر بکەینەوەو ڕێزمانی زمانی کوردی بنووسینەوە، بەتایبەتی لە ئەو ئاستەدا, کە گومان بخەینە سەر( بەشە ئاخاوتن)ێکی گرنگ، وەك (ئاوەڵناو). لە ئەم ڕووەوە، نووسینەکانی ئەو مامۆستایانە زۆر بابەتی خستووەتە ڕوو، بەڵام لە ئەو گۆشە نیگایەوە گومان بخرێتە سەر بەشە ئاخاوتنی (ئاوەڵناو)، نەختێك پەلە کردن و نەختێك زێدەڕۆیی دەرکەوتووە. بە واتایەکی تر، دەبا جۆرە بابەتی ئاوها گرنگ و ناسك لەکاتێکدا بهەژێنرابا، کە ڕێزمانی ئاوەڵناو چیۆەرێژباو لە خودی ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردییەوە خزمەت کرابا. بە داخەوە، لە زۆر بابەتی ڕێزمانیدا، برشتی ڕێزمانی زمانانی تر پێشی برشتی ڕێزمانی کوردی کەوتووەو ڕێزمانی کوردی بە جێماوە لە نووسینەوەی بابەتەکەدا.

بۆ زانین, لە ئەم بەشەدا, پانۆڕامایەك دەکرێتەوە بۆ (٧) بەشەکەی پێشتر, لەبۆ ئەوەی بە هوردی و بە سفتی ڕێزمانی ئاوەڵناو گەمارۆ بدەین.

## ٨- ٢-ناسینەوەی ئاوەڵناو:

لە ڕێزمانی کوردییدا چەند ئەندازەیەك هەیە بۆ ناسینەوەی (ئاوەڵناو)و جیاکردنەوەی لە بەشەکانی تری ئاخاوتن، وەك:

### ئەندازەی یەکەم: تەرخانکردنی ئاوەڵناو:

بۆ نموونە، دەتوانین دوو دەستەواژە بخەینە ڕوو، وەك:

دیوار: ی: بەرز

دیوار: ی: خانوو

لـە نموونـەی یەکەمـدا، ئـامرازی خستنەسـەر(ی) خراوەتـە نێـوان( نـاو)و (ئاوەڵنـاو)و لـە نموونـەی دووەمـدا، خراوەتـە نێـوان( نـاو)و (نـاو) ێکـی تـر. لـە ئـەم هەڵوێستەدا، دەتوانین ئامرازی (ی) لاببەین لەهەردوو نموونەکەدا، وەك:

**دیوار:ی: بەرز ← دیواربەرز**

**دیوار:ی: خانوو ← دیوارخانوو**

لە نموونەیـەی یەکەمـدا، ئاوەڵنـاوی تـەرخانکراو پەیـدابووە وەك(بـالا بـەرز، لـووت بـەرز، سـەربەرز، پاژنەبـەرز،.......). لـە نموونـەی دووەمـدا، بزرکـان پەیـدابووەو نارێزمان هاتووەتە ئاراوە، بەلام لە ریزە نموونەیەکدا وەك (دیوار بەرز، دیـوار نـزم، دیوارشین، دیوار سارد، دیوار پتەو، دیوار زبر، دیوار لووس، دیوار گڕ، دیوار بـۆش، دیوار پڕ، دیوار تەڕ، دیوار پان، دیوار باریك، دیوار ڕاست، دیوار گێڕ،.......)، ڕێزێك لە (ئاوەڵناوی تەرخانکراو) پەیدا بووە بۆ ئەو(خانوو)ەی کە دیواری ئاوەهـای هەیـە. بێگومـان، لەهەرجێیەکـدا کـە ئێڵـی دەرکـەوت، ئـەوا ئـەم ئەندازەیـە دەتوانێـت دەستەواژەی( ناو: ئاوەڵناو) جودا بکاتەوە لە دەستەواژەی( ناو: ناو). واتە، بەلابردنی ئـامرازی(ی) لـە دەسـتەواژەی(ناو: ئاوڵنـاو)دا ڕێزمانەکـە ناشـێوێت‌و ئاوەڵنـاوێکی تەرخاوکراو پەیدادەبێت، بەلام لە ئاستی دەستەواژەی (ناو: ناو)دا ڕێزمانەکە تێـك دەچێت.

## ئەندازەی دووەم: ئامرازی ناساندن(ەکە):

لە ڕاستیدا، ئامرازی(ەکە) بـۆی هەیـە بچێتە سـەر (نـاو) نـەك (ئاوەڵنـاو). هەر لەبەر ئەوە، ئەگـەر دەسـتەواژەکە دوو(نـاو)ی تێـدابێت، ئـەوا دوو جـار ئـامرازی ناساندن(ەکە) بەکار دەهێنرێت، بەلام ئەگـەر یـەك نـاوی تێـدابێت، ئـەوا یـەك جـار بەکاردەهێنرێت. بۆ نموونە، دەستەواژەی (دیـواری بـەرز) یـەك(ناو)ی تێدایـەو هـەر

یەکجار دەتوانین ئامرازی (ەکە) بار بکەین وەك:

دیوار(........ )ەکە

دیوارە( بەرز )ەکە

بە سەرنجێکی هورد، دەردەکەوێت کە ئامرازی ناساندن(ەکە) دەگەڕێتەوە بۆ (ناو)ی (دیوار)، بەلاَم لە نێوبیردانی زمانی کوریدا خانەیەکی بۆش هەیە بۆ (ئاوە لَناو)، بۆ ئەوەی لەکاتی پێویستدا باربکرێت. لە نموونەی(دیواری خانوو)دا، دوو(ناو) هەیەو دەشێت هەر (ناو)ێك بە تەنها ئامرازی (ەکە) وەربگرێت، یان هەردووکیان پێکەوە، وەك:

دیوار(......)ەکەی خانوو (.....)ەکە

.هەر بۆ پرۆڤە، دەتوانین دوو( ئاوەڵناو) باربکەین لە هەردوو(ناو)ەکە، وەك:

دیوارە(نزم)ەکە: ی: خانووە( سوور)ەکە

کەواتە ئەگەر دەستەواژەکە یەك ناوی تێدابێت وەك(دیواری بەرز)، یەکجار ئامرازی(ەکە) دەکەوێتە کارو ئەگەر هەردوو پێکهاتەکە(ناو) بن، ئەوا دووجار دەکەوێتە کار. ئەم ڕاستیە ڕێزمانیە دەگەڕێتەوە بۆ بنەمای:

(ئامرازی "ەکە" دەچێتە سەر "ناو", نەك "ئاوەڵناو" و هەر "ناو"ێك بۆی هەیە یەکجار وەری بگرێت )

## ئەندازەی سێیەم: وەرچەرخانی ئامرازی(ی)بۆ ڕوخساری( ـە).

لە ئەندازەی دووەمدا، ئامرازی (ی) وەك خۆی دەمێنێتەوە، ئەگەر ئامرازی ناساندن(ەکە) بکەوێتە کار لە دەستەواژەی (ناو: ناو) دا، وەك:

دیوارەکە (ی) خانووەکە

کەچی ، هەمان ئامراز دەگۆڕێت بە (ـە) لە دەستەواژەی (ناو: ئاوەڵناو)دا، وەك:

(دیوار: ی : بەرز)

کە دەبێت بە:

(دیوار : ە : بەرز)ەکە

کەواتە، ئامرازی (ی) ئەگەر بکەوێتە پێش (ئاوەڵناو) دوو دیوی هەیە، وەك:

دیوی(ی) : لە دەرەوەی قەوارەی ئامرازی ناساندن(ەکە)

دیوی (ـە) : لە ناو قەوارەی ئامرازی ناساندن(ەکە)

بێگومان، ئەم ئەندازەیەش دەتوانێت توخمی (ئاوەڵناو) جودا بکاتەوە لە توخمی(ناو). بە واتایەکی دیکە، ئەگەر کلکی ئامرازی (ی) لەسەر (ئاوڵناو) بێت، بەزەبری ئامرازی(ەکە) دەبێت بە (ـە).

## ئەندازەی چوارەم: ئامرازی ئاماژە

بەتەریبی لەگەڵ ئەندازەی سێیەمدا، ئامرازی نیشانە (ئاماژە) بۆی هەیە کە ئامرازی (ی) بگۆڕێت بە (ـە)، ئەگەر لە پێش (ئاوەڵناو)ەوە بەکارهێنرابێت، وەك:

ئەو(دیوار: ە : بەرز)ە

بەهەمان شێوە، لە دەستەواژەی ئامرازی گەیەنەردا ئامرازی (ـە) دەردەکەوێت لە پێش (ئاوەڵناو)ەوە، وەك:

**ئەو (دیوار: ە : بەرز)ەی کە ڕووخا**

**ئەندازەی پێنجەم: نیشانەی کۆ(ان):**

نیشانەی کۆ لە زمانی کوریدا تایبەتمەندی خۆی هەیە، چونکە ناچێتە سەر (ناو) وەك زمانانی دی، بەس دەچێتە سەر(ئاوەڵناو)و تەرخانی دەکات بۆ (ئاوەڵناوی کەسان). بە واتایەکی دی ئەگەر لە دەستەواژەیەکدا دوو پێکهاتە هەبوون، وەك:

- پێکهاتەی یەکەم:

**(ناو)ێك، یان(ئاوەڵناو)ێك**

- پێکهاتەی دووەم:

**نیشانەی کۆ(ان) بە ڕووتی.**

ئەوا، پێکهاتەی یەکەم بریتیە لە(ئاوەڵناو). لە هەڵوێستی ئاوهادا، ئەگەر لێڵی دەرکەوت، دەبێت بگەڕێین بۆ ئەو میکانیزمە ڕێزمانیەی کە ئەو(ناو)ەی گۆڕیوە بۆ (ئاوەڵناو)، وەك:

| | | |
|---|---|---|
| جوان | : جوانان | : کەسانی جوان |
| پیر | : پیران | : کەسانی پیر |
| پیاو | : پیاوان | : کەسانی پیاو |
| پاك | : پاکان | : کەسانی پاك |
| کرێکار | : کرێکار | : کەسانی کرێکار |
| مامۆستا | : مامۆستایان | : کەسانی مامۆستا |
| دانیشتوو | : دانیشتووان | : کەسانی دانیشتوو |
| چاولەدەر | :چاولەدەران | : کەسانی چاولەدەر |
| چاوبرسی | : چاوبرسیان | : کەسانی چاوبرسی |

**ئەندازەی شەشەم: ناوی واتایی:**

هەر وشەیەك کە ( ئاوەڵناو) بێت یان توخمی ئاوەڵناوی تێدا هەبێت، ئەوا بۆی هەیە ببێت بە (ناوی واتایی) بە ئامرازی (یی)، وەك :

جوان : جوانی : بەجوانی
پاك : پاکی : بەپاکی
مامۆستا: مامۆستایی : بە مامۆستایی
زوو: زوویی: بە زوویی
چاولەدەر: چاولەدەریی : بە چاولەدەری
پیر: پیری: بە پیری
دانیشتوو: دانیشتوویی : بە دانیشتوویی

وەك لەسەر نموونەکان پیشاندراوە، لە پاش ئەوەی کە (ئاوەڵناو)ەکان ئامرازی (ی) وەردەگرن، دەتوانن بە ئامرازی پەیوەندی (بە)ببن بە ئاوەلگوزارەی چۆنێتی.

**ئەندازەی حەوتەم: کاری(بریتی بوون لە.....) :**

کاری (بوونی ئێستایی) دەتوانێت جووت ببێت لەگەڵ(ناو)و لەگەڵ(ئاوەڵناو)، وەك:

ئەم دیوارە بەرز(ە)
ئەم دیوارە باخ(ـە)

لە ئاستی نموونەی یەکەمدا، کە ئاوەڵناوی (بەرز) بەکارهێنراوە, ناتوانین بڵێین(*):

ئەم دیوارە بریتیی (ـە) لە بەرز(*)

بەڵام لە ئاستی نموونەی دووەمدا، کە ناوی (باخ) بەکارهێنراوە، دەتوانین بڵێین:

ئەم دیوارە بریتیە لە (ـە) لە باخ.

وەك ئەندازەیەکی بەکارو کاریگەر، لە زمانی کوردیدا دەستەواژەی (بریتی بوون لە......) بەهیچ جۆرێك چالاکی نانوێنێت لە ئاستی (ئاوەڵناو)دا، بەڵام زۆر کاریگەرە بەڕووی (ناو)دا، وەك:

-نادروست(*):

بریتی بوون لە (ئاوەڵناو) (*)

-دروست:

بریتی بوون لە (ناو)

کەواتە، لە هەر جێیەکدا کە(ئاوەڵناو)و (ناو) بەڵێڵی دەرکەوتن لە تەرازووی کاری (بوونی ئێستایی)دا، ئەوا دەستەواژەی (بریتی بوون لە......... ) دەبێت بە سەنگی مەحەك بۆ دابڕینی نێوان(ناو)و (ئاوەڵناو). بۆ نموونە وشەی(جوان) جارێك (ئاوەڵناو) و جارێکی دی ناوی کەسانە، وەك:

ئەو (کچە باڵا بەرزە جوانـ)ـە

لەئاستی ئەم نموونەیەدا ناتوانین بڵێین:

ئەو (کچە بەڵابەرز)ە بریتییـ(ـە) لە جوان(*)

بەڵام کاتێك ئەو کچە باڵا بەرزە(ناو)ی (جوان) بێت دەتوانین، بڵێین:

ئەو (کچە باڵا بەرز)ە جوانـ (ـە)

ئەو (کچە باڵا بەرز)ە بریتی یـ(ـە) لە جوان

**ئەندازەی هەشتەم: کاری بوونی بوونایەتی:**

له ئاستی کاری بوونی بوونایەتیدا، دوو بەکارهێنان هەیە، وەك:

-سەودا کردنی(ئاوەڵناو) بەڕاستەوخۆیی ، وەك:

**شیلان هەر (جوان) دەبێت**

-سەوداکردنی (ناو) به ناڕاستەوخۆیی به ئامرازی (به)، وەك:

**شیرەکە دەبێت به (ماست)**

کەواتـه هـەردووکاری (جـوان بوون)و(بـوون بـه شـیر) دەتـوانن کاریگـەری بنـوێنن، چونکه ناتوانین جێگۆڕکێ بکەین به (ئاوەڵناو)ی (جوان)و بـه (نـاو)ی (ماسـت). لـه نموونەیەکی تردا، وەك:

**ئازاد (پیاو) بووە**

یان،

**ئازاد بووە به (پیاو)**

له نموونەیه یەکەمدا، به ئاشکرا دیارەکه توخمی (ئاوڵناو) زاڵه.

**ئەندازەی نۆیەم: نیشانەی بەراورد( تر، ترین):**

ئـەم ئەندازەیـه لەلایـەن زۆربـەی ڕێزماننووسـانەوە بـەکارهێنراوە، چـی لـه سـەر ئاسـتی زمـانی کـوردی‌و چـی لەسـەر ئاسـتی زمانـانی تـردا. ئێمـه خـۆ خـەریك ناکەین به ئەم بابەتەوە چونکه زۆر باسکراوە، بەڵام له پـەرێزی (ئاوەڵنـاو)ی ڕوون‌و

پەتیدا. هەر لەبەر ئەوە ڕوو دەکەین لە بابەتە تەمو مژدارەکان، وەك:

<u>یەکەم</u>: ناوی دووفاق وەك( منداڵ، پیاو، ژن، .....). لە نموونەیەکدا, وەك:

**شیلان (منداڵ) ی (منداڵتر)ی هەیە**

بێگومان (منداڵ) ی یەکەم بریتیە لە (ناو)و (منداڵ)ی دووەم بریتیە لە (ئاوەڵناو)، بەڵام دەگوترێت:

**شیلان.......منداڵتری هەیە**

ئەم ڕستەیە بریتیە لە ڕستەکەی پێشتر، بەڵام ڕێزمانەکە ڕێی پێ داوە کە کورت بکرێتەوە.

<u>دووەم</u>: لە نموونەیەکدا وەك (لە دەر)، ئامرازی پەیوەندی (لە) و ئاوەڵکاری( دەر) بابەتی (ئاوەڵناو ) یان چی کردووە، بەڵام ئاوەڵناوەکە ڕوون نیەو دەشێت ڕوون بکرێتەوە بە:

**لە دەر ؛ لەدەرتر ؛ لە دەرترین**

بەپێی ئەندازەی یەکەم دەشێت بزاڤی تەرخانکردن بخەینە کارو ڕوونتری بکەینەوە، وەك:

**(چاو) لەدەر؛ (چاو) لەدەرتر؛ (چاو) لەدەرترین**

کەواتە، لەم ڕووبەرە شێڵووەیشدا، نیشانەکانی ( تر، ترین) کاریگەری خۆیان هەیە، وەك( ئاوەڵناوسەوە).

<u>سێیەم</u>: لەنموونەیەکی لێڵدا وەك (دانیشتوو) سەمتی(کار) تێکەڵ بووە بە سەمتی (ئاوەڵناو)، وەك:

-سەمتی کار:

من (دانیشتوو)م لە ئەم شارە

-سەمتی ئاوەڵناو:

من (دانیشتوو)نیم لە ئەم شارە

لە نموونەی یەکەمدا، چەمکی(پارتیسیپ) زاڵەو سەمتی (کار) لەئارادایە. لە ئاستێکی ڕێزمانی بەرزترو شکۆدارتردا، نموونەی دووەم دەگەڕێتەوە بۆ سەمتی(ئاوەڵناو)و بەپێی ئەندازەی سێیەم، ئامرازی ( ی) دەگۆڕێت بە (ـە)، وەك :

کەس : ی : دانیشتوو

کە دەبێت بە:

کەسـ: ـە : دانیشتووەکە

لەهەمان کاتدا، بەپێی ئەندازەی پێنجەم، ئامرازی کۆ (ان) وەدەگرێت، وەك:

دانیشتوو: دانیشتووان

بەپێ ئەوەی گوترا، وشەی دانیشتوو(ئاوەڵناو)ەو دەبێت نیشانەی ( – تر، – ترین) وەربگرێت، وەك:

دانیشتوو: دانیشتووتر : دانیشتووترین

لەڕاستیدا، لە ئەو ئاستە بەرزەی زمانزانیدا، دەتوانین لە ئێستاو لە ئایندەدا نموونەی وەك ئەوانەی پێشەوە بدۆزینەوە، بەتایبەتی لە تەکنەلۆژیای تازەدا، وەك:

ئەم واشەرە جوان دانیشتووە، بەڵام ئەوەی تر دانیشتووترە

چوارەم: لە نموونەی ئاوەڵکارێکدا وەك( زوو) دەشێت سەمتی(ئاوەڵناو) هاوێر بکەین، وەك:

زوو: زوتر: زووترین

یان بەپێی ئەندازەکانی پێشەوە دەگۆڕێت بۆ:

زوو: زوویی : بەزوویی

پێنجەم: بەتەریبی لەگەڵ نیشانەی(ــتر، ـترین)دا، پێشگری (هەرە) بەکار هێنراوەو ئەم پێشگرەیش بریتیە لە(ئاوەڵناوناسەوە)یەکی زۆر زرنگو بلیمەتو گەزاف خۆی ناگەیەنێت بەهیچ بەشێکی ئاخاوتن، تەنها بە(ئاوەڵناو) نەبێت.

ئەندازەی دەیەم: نیشانەی نەناسراوی (ێك):

لەهەر جێیەکدا کە ئامرازی(ێك ) بەکار هێنرا، ئەوا ئەو نیشانەیە دەگەڕێتەوە بۆ (ناو)، نەك بۆ (ئاوەڵناو). بۆ نموونە، ئەگەر گوترا(جوانێك)، ئەوا لە ڕەسەندا نیشانەی (ێك) دەگەڕێتەوە بۆ (ناو)ێك، وەك:

جوانێك : کەسێکی جوان

هەر بۆ پراوە، ئەگەر توانرا (جوانێك ) بکرێت بە (کەسێکی جوان)، ئە وا وشەی( جوان) بریتیە لە(ئاوەڵناو). یان ئەگەر نەتوانرا، ئەوا ئەو وشەیە بریتیە لە (ناو)، وەك(بەردێك، باخێك، دیوارێك، مۆمێك، گوڵێك،.....)، چونکە نیشانەی (ێك) هی خۆیانە. لە نموونەی(جوانێك)دا، نیشانەی(ێك) درایەوە بەناوی(کەس)، چونکە هی (ئاوەڵناو)ەکە نیە، لە ئەم ڕووە وە، ئاوەڵناوەکانی (پاکێك، زانایەك، ژیرێك، بەهێزێك،......) دەشێت بە ئەو میکانیزمەی پێشەوە نیشانەی(ێك) فڕێ بدەن، وەك:

پاکێك : کەسێکی پاك

زانایەك : کەسێکی زانا

ژیرێك : کەسێکی ژیر

بەهێزێك: کەسێکی بەهێز

لە ئاستی وشەیەکدا، وەك(کەر) کە هەم( ناو)ەو هەم(ئاوەڵناو)ێکی خوازراوە. دەشێت نیشانەی (ێك) هەڵوێستەکە یەکلایی بکاتەوە، بۆ نموونە، ئەگەر گوترا(کەرێك) وتوانرا بکرێت بە (کەسێکی کەر)، ئەوا وشەی (کەر) لە بەشە ئاخاوتنی (ئاوەڵناو)دایە، بەڵام ئەگەر گوترا(کەرێك)و دەستەواژەکە لۆك بوو ونە توانرا نیشانەی(ێك) لابرردرێت، ئەوا وشەی(کەر) لە بەشە ئاخاوتنی (ناو)دایە.

## ٨- ٣- گەزافی ئەندازەکان:

لە ئەم نووسینەدا، دە ئەندازە کراون بە (پێوەر) بۆ جودا کردنەوەی(ئاوەڵناو) لە (ناو)و لەئاستی هەر ئەندازەیەکدا چەند نموونەیەك بەکارهێنراون. لە ئێرەدا، هەوڵ دەدەین گەزافو بڕشتی ئەندازەکان پیشان بدەین بە بەکارهێنانی(ناو)ێك وەك(بەرد)، لەجێی.(ئاوەڵناو)دا، وەك:

<u>ئەندازەی یەکەم: بزاڤی تەرخانکردن لە ئاوەڵناودا:</u>

لە دەستەواژەیەکدا، وەك:

خانوو: ی: بەرد

ئەگەر ئامرازی (ی) بەتەواوی لابردرا، وەك:

خانوو بەرد (*)

ئەوا، ڕوو دەکەین لە (نارێزمان)و ئەگەر بە زۆرەملێ ناوی (بەرد) بکەین بە(ئاوەڵناو)،دەبینین کە ئاوەڵناوێکی تەرخانکراو پەیدا دەبێت:

خانووبەرد: ئەو کەسەی خانووەکەی لەبەردە

کەواتـە، ئەنـدازەی (تـەرخانکردنی ئاوەڵنـاو) زۆر بـەهێزەو شـەبەنگی (ئاوەڵنـاو) دەخاتە سەر( ناو) بۆ ئەوەی بە زۆرەملێ ببێت بە (ئاوەڵناو).

**ئەندازەی دووەم: ئامرازی ناساندن(ەکە):**

ئەگەر ئامرازی ناساندن(ەکە) بخەینەسەر ناوی (بەرد)، وەك (بـەرد ەکە)، ئـەمجارە لەسـەر ئەنـدازەو پێوانـەی (خـانووە بەرزەکـە) دەتـونین بڵـێین (خـانووە بەردەکـە). ئـەم جـارەیش دەسـتەواژەکە شـەبەنگی (ئاوەڵنـاو) دەبەخشـێت بـە وشـەی(بەرد)، تـا ببێـت بـە ئاوەڵنـاو بـە زۆرەملـێ، چـونکە لـە خانـەی(ئاوەڵناو)دا دانیشتووە.

**ئەندازەی سێیەم: وەرچەرخاندنی ئامرازی (ی) بۆ( ـە).**

بـۆ نموونـە ئەگـەر ئـامرازی ( ی ) لـە (خـانووی بەردەکـە)دا بگـۆڕێن بـۆ ئامرازی (ـە)، وەك (خانووە بەردەکە)، ئەوا دەکەوین بەسـەر ئـەو ئەنجامـەدا کـە لـە ئەندازەی دووەمدا بەدەست هاتووە. واتە، جارێکی تر (ناو)ی (بـەرد) دەکەوێتـە ژێـر ڕکێفی ئاوەڵناوەوە، بەڵام بەزۆرە ملێ، چونکە ئەنـدازەی دووەم و سـێیەم بەیەکەوە پەیوەستن.

**ئەندازەی چوارەم: ئامرازی ئاماژە:**

ئەگەر وشەی(بەرد) بخەینە نێـو خانەیـەك کـە بـۆ (ئاوڵناو)تـەرخانکرابێت، وەك:

ئەو (دیوارە بەرد)ە

ئەوا لە ئێرەشدا، شەبەنگی (ئاوەڵناو) دەچێتەسەر وشەی (بەرد)، چـونکە بـە نـاڕەوا لە خانەی (ئاوەڵناو)دا دانیشتووە.

**ئەندازەی پێنجەم: ئامرازی کۆ(ان):**

ئەگەر ئامرازی کۆ(ان) بخەینەسەر ناوی (بەرد)و ببێـت بـە (بـەردان)، ئـە وا ڕوودەکەین لە(ناڕێزمان)، چونکە:

**یەکەم:** سەمتی(ناو)، لە زمانی کوردیدا، ئامرازی (ان)وەرناگرێت.

**دووەم:** وەك ئامرازی (ان) هی (ئاوەڵناو)ەو هی (ناو)نیە، لە ئاوەڵناویشدا، ڕوو دەکات لە ( ئاوەڵناوی کەسان)، وەك :

**جوانان: کەسانی جوان**

**ئەندازەی شەشەم: ناوی واتایی:**

ئەگەر زۆر بکەین لەناوی (بەرد)و بیکەین بە (بەردی)و لە پاشتردا بڵێین:

**(بە بەردی) دامەنیشە**

ئەوا، بە زۆرە ملێ ناوی (بەرد) سیمای (ئاوەڵناو) وەردەگرێت، چونکە لە خانەی ئاوەڵناودا بەکارهێنراوە.

**ئەندازەی حەوتەم: کاری (بریتی بوون لە ....):**

لەنموونەیەکدا، وەك:

**خشتی ئەم دیوارە بەردە**

یان :

**خشتی ئەم دیوارە بریتیە لە بەرد**

هیچ (نارێزمان)جێ نابێت، چونکە کاری(بریتی بوون لە......) هەر بابەتی (ناو)وەردەگرێتو ناشێت(ئاوەڵناو) بەکاربهێنرێت، وەك:

**ئەم بەردە برتییە لە ڕەق (*)**

بەس دەگوترێت:

**ئەم بەردە ڕەقە**

**ئەندازەی هەشتەم: کاری بوونی بوونایەتی:**

لە ئاستی (بوونی بوونایەتی)دا، ناتوانین ناوی (بەرد)بخەینە جێی (ئاوەڵناو) بۆ نموونە، دەگوترێت:

**ئەم گڵە دەبێت بە (بەرد)**

بەس ناگوترێت:

**ئەم گڵە بەرد دەبێت(*)**

لە نموونەی دووەمدا، دەڵێیت بەزۆرە ملێ وشەی (بەرد) کراوە بە (ئاوەڵناو).

**ئەندازەی نۆیەم: نیشانەی بەراورد(تر، ترین):**

بۆ پرۆڤە ئەگەر گوترا:

**بەرد: بەردتر : بەردترین**

لەسەر ئەندازەی :

**ڕەق : ڕەقتر : ڕەقترین**

ئەوا گەزافی ئامرازی(-تر، -ترین) زۆر دەکات لە (ناو)ی (بەرد) بۆ ئەوەی شەبەنگی (ئاوەڵناو) وەربگرێت، چونکە بە ناهەق بارکراوە لە خانەی (ئاوەڵناو).

**٨- ٤-ڕووبەرە واتایەکانی ئاوەڵناو:**

لەڕووی واتاوە، ئاوەڵناوەکانی زمانی کوردی دابەش دەبن بەسەر چەند ڕووبەرێکدا، وەك:

**یەکەم: ئاوەڵناوی ڕەنگ:**

**سور، زەرد، شین، سەوز، بۆر، مۆر، سپی....**

**دووەم: ئاوەڵناوی تەمەن:**

**لاو، گەنج، منداڵ، ساوا، هەراش، کۆرپە، زارۆ، زارۆك، پیر.........**

**سێیەم: ئاوەڵناوی خێرایی:**

هێواش، خێرا، هێور، هێدی، تیژ،..

**چوارەم: ئاوەڵناوی ئاکاری فیزیاوی:**

گەورە، بچووك، زل، قەبە، کەتە، فراوان، تەنگ، تەسك، باریك، بەرز، نزم، دۆڵ، تیژ، کورت، درێژ، لێڵ، ڕوون، تاریك، ساغ، تەڕ ، وشك،....

**پێنجەم: ئاوەڵناوی زایەندی:**

نێر، مێ، ژن، پیاو، مێرد، کچ، کوڕ، دەڵ، گەماڵ، ماچە، ....

**شەشەم: ئاوەڵناوی چێژ:**

شیرین، تاڵ، تفت، تیژ، ترش، خۆش، مرز.........

**حەوتەم: ئاوەڵناوی هۆشەکی:**

زیرەك، ئازا، گێل، گەمژە، زرنگ، بلیمەت، گێژ، وریا، وێل، سوور، گەلۆر، تەپۆ،...

**هەشتەم: ئاوەڵناوی چەندێتی:**

کەم، زۆر، فرە،.......

**نۆیەم: ئاوەڵناوی خزمایەتی:**

برا، خوشك، باوك، دایك، مام، پوور، داپیر، باپیر، خەسوو، خەزوور، زاوا، بووك،...

**دەیەم: ئاوەڵناوی پلەی گەرما:**

سارد، گەرم، فێنك، نسرم، داخ، ....

لە هەندێك لەسەرچاوەکاندا ڕووبەرەکانی ئاوەڵناو دابەش کراون بەسەر حەوت ڕووبەرداو مەرجی ئەوەش دانراوە کە دەبێت ئاوەڵناو دژواتای خۆی هەبێتو بەهەردووکیان (جووت) پێك بێهنن. لەڕاستیدا، ئێمە لەگەڵ ئەوەدا نین کە بابەتی(ئاوەڵناو) بەراورد بکرێت بە زمانانی تر، تا لەزمانەکەی خۆماندا بەتەواوی هەرس نەکرێت بەرێزمان، چونکە ڕێزمانی ئەم بابەتە زۆر هوردو ناسكو دانسقەیە، یان ڕێزمانی (ئاوەڵناو) بۆی هەیە کە پەیامی خۆی هەبێت بۆ هەمان

بابەت لەزمانانی تردا. بۆ نموونە، لە زمانی کوردیدا، سەمتی (ناو) لە کلکەوە ئامرازی ناساندن(ەکە) وەردەگرێت، وەك(دارەکە)، بەڵام ئەم ڕێزبەندە مۆرفۆلۆژییە(کلۆری) تێدا هەیە، چونکە خانەیەکی بۆش هەیە بۆ(ئاوەڵناو) لەنێوان ناوی ( دار)و ئامرازی (ەکە)، وەك:

**دارە (.....)ەکە : دارە(سەوز)ەکە**

واتە، وشەی(دار)بەهۆی ئامرازی بەستن(ی) ئاوەڵناوی (سەوز)ی وەرگرتووەو بووە بە (داری سەوز), بەڵام ئامرازی ناساندن (ەکە) بەکارهێنراوەو ئامرازی (ی) گۆڕیوە بۆ (ـە) و ریزبەندییەکی پتەویش چەسپاوە، وەك:

١ ٢ ٣ ٤

| ناو: (ـە) : ئاوەڵناو : (ەکە)|

وەك:

١ ٢ ٣ ٤

| دار: (ە) : سەوز : (ەکە)|

ئەم ڕێزبەندە ڕێسایەکی توکمەی پەیدا کردووەو دەشێت وەك سەنگی مەحەك بەکاربهێنرێت بۆ (ناسینەوە)ی ئاوەڵناو. لە بەشەکانی ئەم نووسینەدا، ئەم ڕێسایە کراوە بە میلی ئەندازەکێشیو چەندین جار بەکارهێنراوە لە ناسینەوەی ئاوەڵناودا. بێگومان، ڕێزماننووسان بە ئەم بابەتە وێراونو زۆر نموونەیان ڕیز کردووەو چەندین پۆلیان دیاری کردووە. هەندێك لەسەرچاوە ئینگلیزییەکان ئاوەڵناو دابەش دەکەن بەسەر حەوت ڕووبەرداو هەندێك ڕێزماننووسی کوردیش، بەبێ بەڵگەو بەبێ نموونە دەڵێن، زمانی کوردی ناتوانێت گشت ڕووبەرەکانی ئاوەڵناو پڕ بکاتەوە. هەر لەبەر ئەوە دەگوترێت لەڕێزمانی کوردیدا بەشە ئاخاوتنی(ئاوەڵناو) زۆر لاوازە، یان هەر نیەتی. ئێمە تێناگەین، کەسانێك کە هێشتا

لەڕێزمانی کوردیو لە ڕێزمانی ئاوەڵناودا ناشارەزابن، چۆن دەتوانن دەست ببەن بۆ بابەتی ئەوها هوردو ناسك.

## ٨- ٥- چەند ڕاستیەك لەڕێزمانی ئاوەڵناودا:

لەنێو ڕێزمانی (ئاوەڵناو)دا، چەند ڕاستیەك هەیەو ئەو ڕاستیانە ئەدگارەکانی دەردەخەنو جودای دەکەنەوە لەبەشەکانی تری ئاخاوتن، بەتایبەتی لەسەمتی (ناو)، وەك:

**<u>یەکەم</u>:** ئاوەڵناو نابێت بە (بکەر)، نابێت بە (بەرکار)و نابێت بە(بەرکاری ڕاستەوخۆ)، وەك:

-<u>بکەر</u>:

**جوانێك هات**

لەڕەسەندا بریتیە لە:

**کەسێکی جوان هات**

-<u>بەرکار</u>:

**من جوانێکم بینی**

لە ڕەسەندا برتیە لە:

**من کەسێکی جوانم بینی**

-<u>بەرکاری ناڕاستەوخۆ</u>:

**من نامەکەم دا بەجوانێك**

لە ڕەسەندا بریتیە لە:

**من نامەکەم دا بەکەسێکی جوان**

لە ڕێزمانی کوردیدا، ڕێ دراوە کە ئەو ئاڵو گۆڕە ڕێزمانیە بکرێت، وەك:

**کەس : ێك :ی: جوان ← جوان : ێك**

واتە، ئاوەڵناوی (جوان) چووەتە نێو خانەی ناوی (کەس)و ئامرازی(ێک)ی لێ وەرگرتووە، لە ئەم هەڵو مەرجەدا ئامرازی(ی) ڕۆڵی نەماوەو ئاودیو بووە لە ڕێزەکەدا. بێگومان، ئەم بۆچوونەی ئێمە دژ دەوەستێت لەگەڵ بۆچوونی ڕێزماننوسەکانی تردا، چونکە لەهەر جێیەکدا ڕۆڵێ سینتاکسییان دا بێتە پاڵی(ئاوەڵناو)، ئەوا لە ڕێزمانی ڕستەکە تێ نەگەیشتوون. یان، ئاگایان لە ڕێسایەك نیە کە ڕوخساری دەستەواژەی (ناو)و (ئاوەڵناو) کورت دەکاتەوە، وەك:

**ناو : (ێك) : (ی) : ئاوەڵناو : کەسێکی جوان**

بە شێوازێکی کورتتر:

**ناو : (ێك) :( ......): ئاوەڵناو : کەسێ جوان**

یان زۆر کورتتر:

**ئاوەڵناو: (ێك) : (....) : ........: جوانێك**

لە چینی دووەمدا، دەنگی (ك) بەرەو خپ بوون چووەو زۆر بەدەگمەن دەگوترێت (کەسێك جوان).

<u>دووەم</u>: بابەتی ئاوەڵناو نیشانەی ناسراوی (ەکە)و نیشانەی نەناسراوی(ێك) وەرناگرێت، چونکە ئەم دوو نیشانەیە هی سەمتی (ناو)ن، نەك هی(ئاوەڵناو). هەر بۆ پرۆڤە، ئەگەر گوترا:

**جوانەکە، درێژەکە، سوورەکە**

لە ڕەسەندا، ئەم دەستەواژانە بریتین لە :

**کەسە جوانەکە، گوڵە جوانەکە**

**دارە درێژەکە، پیاوە درێژەکە**

**بەردە سوورەکە، جلە سوورەکە**

.یان، ئەگەر گوترا:

جوانێك، درێژێك، سوورێك

ئەوان، لە ڕەسەندا ئەم دەستەواژانە دەبن بە:

کچێکی جوان، کەسێکی جوان
پیاوێکی درێژ، دارێکی درێژ
بەردێکی سوور، جلێکی سوور

لەڕاستیدا، لەهەر جێیەکدا نیشانەی(ەکە)و(ێك) ببینین بە (ئاوەڵناو)ەوە، ئەوا ئەو ئاوەڵناوە بە (بێگار) هەڵی گرتووە، چونکە لەڕەسەندا هی ناوێکە کە ڕێزمانەکە ڕێی داوە لابچێت. هەر بۆ نموونە, دوو(ناو) هەیە لە دەستەواژەیەکدا، وەك (گوڵی باخ). هەر لەبەر ئەوە، دەتوانین دوو جار نیشانەی ناسراوی(ەکە) باربکەین، وەك (گوڵـ ـەکەی باخـ ـەکە). یان، دەتوانین دووجار نیشانەی نەناسراوی (ێك) بار بکەین، وەك (گوڵـ ـێک ـی باخـ ـێك). لەبەرانبەردا، یەك ناو هەیە لە دەستەواژەیەکدا، وەك (گوڵی سوور). هەر لەبەر ئەوە دەتوانین یەك جار نیشانەی ناسراوی (ەکە) بار بکەین، وەك (گوڵە سوورەکە). یان، دەتوانێن یەکجار نیشانەی نەناسراوی (ێك) باربکەین، وەك (گوڵـ ـێکـ ـی سوور). ئەم ڕاستیەش بریتیە لەبەڵگەڵەیەکی (پتەو) بۆ گەڕاندنەوەی هەردوو نیشانەی (ەکە) و (ێك) بۆ ڕێزمانی (ناو)، نەك (ئاوەڵناو).

سێیەم: نیشانەی کۆ(ان) هی سەمتی (ناو) نیە بەڵکو هی سەمتی (ئاوەڵناوە)و بۆ کەسان بەکاردەهێنرێت، وەك:

جوان: جوانان, گێل: گێلان
زرنگ: زرنگان, ژیر: ژیران

لە ئەم ڕووەوە، نیشانەی کۆ(ان)، ناچێتەسەر ئاوەڵناوێک کە نەبێت بە پاڵپشتێکی (بەجێ) بۆ کەسێك. لەلایەکی ترەوە، نیشانەی کۆ(ان) دەچێتە سەر دیوی(ئاوەڵناو) لەهەندێك ناوی دوو فاق دا، وەك:

پیاو: پیاوان، ژن: ژنان

کچ: کچان، کوڕ: کوڕان

بێگومان ، لەڕێزمانی دێرینی کوریدا هێشتا نیشانەی کۆ(ان) دەدرێتە پاڵ (ناو)، نەك (ئاوەڵناو). لە ئەم گۆشە نیگایەوە، چەندین نموونەی خواروخیچ ڕێزکراون لەئاستی (ناوی کۆ)دا.

**چوارەم:** هەر ئاوەڵناوێك خانەیەك هەڵ دەگرێت لە نووکەوە بۆ (ناو)ێك کە ئاوەڵناوێکی تەرخانکراوی لەگەڵدا جێ دەکات، وەك:

(دڵ)پاك: ئەو کەسەی دڵ(ی) پاکە.

(دەست)پاك: ئەو کەسەی (دەست)ی پاکە

(ڕوو) پاك: ئەو کەسەی ڕوو(ی) پاکە

ئاوەڵناوی (پاك) تەرخان دەکرێت بۆ (بەش)ێك لە کەسێکدا، یان لە تشتێکدا. بۆ نموونە، ئاوەڵناوی(دڵپاك) واتای (دڵی پاك) هەڵ دەگرێت لەئاستی (کەس)ێکدا کە خاوەن ئەو دڵە پاکەیە. یان، ئاوەڵناوی (دیوارنزم) ڕوو دەکات لە خانوویەك کە دیوارەکەی نزمە.

**پێنجەم:** ئامرازی (ـە)، لە ئاستی نیشانەی ناساندن(ەکە)و لە ئاستی(ئامرازی نیشانە)، دەستەواژەی (ناو)و(ئاوەڵناو) ئامرازی بەستن(ی) دەگۆڕێت بۆ ئامرازای(ـە)، وەك:

دار(ی) سەوز

ئەو دارە(ە)سەوزە

دار(ە) سەوزەکە

**شەشەم**: وەك لە خاڵی سێیەمدا باس کرا، هەندێك جار ڕووبەری سەمتی(ئاوەڵناو)و ڕووبەری سەمتی (ناو) دەبن بە هاوبەش، واتە، هەندێك ووشەی کوردی هەیە کە دیوی(ناو)و دیوی (ئاوەڵناوی) ی هەیە، نەخشەی (٨- ١).




نەخشەی (٨- ١): ڕووبەی هاوبەش لە نێوان ناو و ئاوەڵناو.

لە دیوی (ناو)دا, دەگوترێت:

پیاوێك، دوو پیاو، پیاوەکە، ئەو پیاوە،.........

لەدیوی (ئاوەڵناو) دا، دەگوترێت:

هاوڕێی پیاو، پیاوەتی، پیاوتر،.

پیاوترین، پیاوان، ، ناپیاو(پیاوو ناپیاو)....

یان دەشێت هەردوو ڕووبەرەکە پێکەوە بکەین بە نموونەو بەریزبەندی (ناو، پاشان، ئاوەڵناو)وەك:

**پیاوی پیاو، ئەو پیاوە ناپیاوە، پیاوە پیاوەکان، پیاوە ناپیاوەکە،**
**پیاوە پیاوەکە، پیاوێکی پیاو، پیاوێکی پیاوانە، ...**

حەوتەم: ئاوەڵناو ئەدگاری بەراوردو پلەی چەندێتی هەڵدەگرێت، وەك:

- پلەی بەراورد، وەك:

**جوان: جوانتر : جوانترین**

- پلەی چەندێتی، وەك:

**زۆر جوان، کەم جوان، نە ختێك جوان، هەرە جوان**

- پلە زێدەڕۆیی، وەك:

**شیلان باش باشەکەی هەڵ ببژێرە (واتە هەرە باشەکە)**
**ئێمە سێوە خراپ خراپەکەمان بەرکەوتووە (واتە هەرە خراپەکە)**
**ئەوان جوان جوانەکەیان بردووە (واتە هەر جوانەکە)**

هەشتەم: ئاوەڵناو دەبێت بەبنکە بۆ (ناوی واتایی) و ناوی واتاییش دەبێت بە بنکە بۆ (ئاوەڵگوزارە)، وەك:

**جوان : جوانی : بە(جوانی)**
**نیان: نیانی : بە(نیانی)**
**پان: پانی : بە( پانی)**
**ڕێك : ڕێکی : بە (ڕێکی)**
**فراوان:فراوانی : بە (فراوانی)**

## ٨- ٦-ئەرکەکانی ئاوەڵناو:

لە ڕێزمانی کوریدا، توخمی (ئاوەڵناو) چەند ئەرکێکی وشەسازییانەی لە ئەستۆیەو بەس. واتە، ئاوەڵناو بۆی نیە بەڕەسەنی ئەرکێکی ڕستەسازییانە بگێڕێت لە جیاتی توخمی (ناو). بە واتایەکی دن، ئاوەڵناو نابێت بە (بکەر)، یان بە (بەرکار)، یان بە بەرکاری ناڕاستەوخۆ. ئەمەو لەڕووی ئەرکەوە، دەشێت ئەو کەلینانە دیاری بکەین کە ئاوەڵناو پڕیان دەکاتەوە، وەك:

### ئەرکی یەکەم:پەسن کردنی (ناو):

لە ئەم ئەرکەدا ڕیزبەندێك جێ دەبێت, چونکە ئامرازی (ی) چێوەبەندێك جێ دەبێت و دوو خانە بۆش دەکاتەوە, لە سەرەوە خانەیەك بۆ (ناو) و لە کلکەوە خانەیەك بۆ (ئاوەڵناو):

| | | |
|---|---|---|
| ئاو | : ی | : ڕوون |
| گوڵ | : ی | : زەرد |
| سێو | : ی | : مزر |
| جل | : ی | : تەڕ |
| خاك | : ی | : وشك |

بزوێنەری سەرەکی لە ئەم دەستەواژەیەدا بریتیە لە ئامرازی بەستن(ی)، کە لە نووکەوە (ناو)ێکی هەڵگرتووەو کە لە کلکەوە ( ئاوەڵناو)ێکی لەتەکدا جووت کردووە. لە ئەم جۆرە دەستەواژەیەدا چەند ڕاستیەك هەیە کە بە هیچ جۆرێك لە دەستەواژەی تردا نیە، وەك:

**یەکەم:** ئەگەر دەستەواژەکە ببێت بە بارگەی ئامرازی ناساندن (ەکە)، ئەوا ئامرازی بەستن(ی) ڕوخسار دەگۆڕێت بۆ (ـە)، وەك:

ئاو: ە : ڕوونەکە

گوڵ: ە : زەردەکە

سێوە: ە : مزرەکە

جل: ە : تەڕەکە

خاك: ە : وشکەکە

دووەم: بەهەمان شێواز ، ئەگەر دەستەواژەکە ببێت بە بارگەی ئامرازی نیشانەو ئامرازی گەیەنەر، ئەوا ئامرازی (ی) دەگۆڕێت بۆ (ـە)، وەك:

ئەو (ئاو: ە : ڕوون)ـە

ئەو (گوڵ: ە : زەردە)ـە

ئەو (سێو: ە : مزر)ـە

ئەو (جل: ە : تەڕ)ـە

ئەو (خاك: ە: وشك)ـە

سێیەم: دەرئاژینی ئامرازی (ی) لەدەستەواژەکە دەبێت بە هۆی پەیدابوونی (ئاوەڵناوی تەرخانکراو)، وەك:

ئاو: ......: ڕوون← کووپەی (ئاو- ڕوون)

گوڵ: ......: زەرد ← داری (گوڵ-ْزەرد)

سێو: .... : مزر ← داری (سێو- مزر)

جل: ..... : تەڕ ← منداڵی (جلْ- تەڕ)

خاك: .... : وشك ← وڵاتی (خاك- وشك)

بێگومان، ناوەڕۆکی ئەو سێ خاڵەی سەرەوە دەشێت بکرێن بە (ئاوەڵناو ناسەوە) بۆ ناسینەوەی (ئاوەڵناو) لە دەستەواژەی لێڵەکاندا.

## ئەرکی دووەم: پاڵپشت بۆ کاری (بوونی ئێستایی):

لە ڕێزمانی کوریدا، مەکینەی کاری(بوونی ئێستایی) زۆر بەهێزە بۆ هەرس کردنی هەر ئاوەڵناوێکی (بەجێ). لە ئەم ڕووەوە، چالاکیە ڕستەسازییانەکە دەگەڕێتە بۆ کاری(بوونی ئێستایی)، بەڵام چالاکیە واتاییەکە دەگەڕێتەوە بۆ (ئاوەڵناو). واتە، کاتێك کە کاری بوونی ئێستایی وتوخمی ئاوەڵناو لەیەکتری جووت دەبن، ئاوەڵناوەکە دەبێت بەجۆرێك لە (واتا بەست)، یان( واتا گوزمرێن) و چالاکییە ڕستەسازییەکە کاری( بوونی ئێستایی )لەسەر گرێژەنەو تەوەری واتایەك دەبەستێت، وەك (شیلان جوانە). لە ڕاستیدا، ئەرکی ڕستەسازییانە لە ئەستۆی کاری(بوونی ئێستایی)دایە، کەچی ئەرکی واتایی بەشێوەیەکی (ستاتیکی) لە ئەستۆی ئاوەڵناوەکەدایە، بەڵام واتای کاری (بوونی ئێستایی) دەیخاتە سەر باری (دینامیکی). بەواتایەکی دن، واتای ڕستەکە تێکەڵەیەکی دارێژراوە، بەڵام بارە ڕستەسازییەکەی سادەیە. ئەمەو لەڕووی ڕێزبەندەوە، ئەم جۆرە دەستەواژەیە ڕێسایەك دەخەنەڕوو، وەك:

| | | |
|---|---|---|
| (ناو) | (ئاوەڵناو) | (بوونی ئێستایی) |

یان:

| | | |
|---|---|---|
| (بکەر) | (پاڵپشت) | (ڕێژەکانی کاری بوون) |

بێگومان، ئەمە کۆتایی ڕێگاکە نیە، چونکە ئەو ڕێزبەندە دوو خانەی بۆشی تێدا هەیە کە دەکەونە نێوان ئاوەڵناو(جوان) وڕێژەی کاری بوونی ئێستایی(ـە)، وەك:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| (ناو) | (ئاوەڵناو) | (.....) | (.....) | (بوونی ئێستایی) |

## ئەرکی دووەم: پاڵپشت بۆ کاری (بوونی ئێستایی):

لە ڕێزمانی کوردیدا، مەکینەی کاری(بوونی ئێستایی) زۆر بەهێزە بۆ هەرس کردنی هەر ئاوەڵناوێکی (بەجێ). لە ئەم ڕووەوە، چالاکییە ڕستەسازییانەکە دەگەڕێتە بۆ کاری(بوونی ئێستایی)، بەڵام چالاکییە واتاییەکە دەگەڕێتەوە بۆ (ئاوەڵناو). واتە، کاتێك کە کاری بوونی ئێستایی وتوخمی ئاوەڵناو لەیەکتری جووت دەبن، ئاوەڵناوەکە دەبێت بەجۆرێك لە (واتا بەست)، یان( واتا گوزەرێن) و چالاکییە ڕستەسازییەکە کاری( بوونی ئێستایی )لەسەر گرێژەنەو تەوەری واتایەك دەبەستێت، وەك (شیلان جوانە). لە ڕاستیدا، ئەرکی ڕستەسازییانە لە ئەستۆی کاری(بوونی ئێستایی)دایە، کەچی ئەرکی واتایی بەشێوەیەکی (ستاتیکی) لە ئەستۆی ئاوەڵناوەکەدایە، بەڵام واتای کاری (بوونی ئێستایی) دەیخاتە سەر باری (دینامیکی). بەواتایەکی دن، واتای ڕستەکە تێکەڵەیەکی داڕێژراوە، بەڵام بارە ڕستەسازییەکەی سادەیە. ئەمەو لەڕووی ڕێزبەندەوە، ئەم جۆرە دەستەواژەیە ڕێسایەك دەخەنەڕوو، وەك:

| | | |
|---|---|---|
| (ناو) | (ئاوەڵناو) | (بوونی ئێستایی) |

یان:

| | | |
|---|---|---|
| (بکەر) | (پاڵپشت) | (ڕێژەکانی کاری بوون) |

بێگومان، ئەمە کۆتایی ڕێگاکە نیە، چونکە ئەو ڕێزبەندە دوو خانەی بۆشی تێدا هەیە کە دەکەونە نێوان ئاوەڵناو(جوان) وڕێژەی کاری بوونی ئێستایی(ـە)، وەك:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| (ناو) | (ئاوەڵناو) | (.....) | (.....) | (بوونی ئێستایی) |

له ڕێزمانی کاردا، خانـەی یەکـەم بـۆ نیشانەی نـەرێ( نـی ) تـەرخانکراوەو خانـەی دووەم بەبێ (بارگە) دەمێنێتەوە بۆ پێشکاری بەردەوامی (دە, بـ) له کارەکانی تردا.

(ناو) : ئاوەڵناو : (نەرێ ): ( ...... ) : بوونی ئێستایی

(شیلان) : زیرەك :(نی) : (......) : یـ ( ـە )

**<u>ئەرکی سێیەم: بەتەریبی لەگەڵ (بوونی ئێستایی ) :</u>**

کاری (بوونی بوونایەتی) خانەیەکی بۆشی هەڵگرتووە بۆ هەر ئاوەڵناوێکی (بەجێ)، بەهەمان (ڕیزبەند)ی کاری بوونی ئێستایی، وەك:

| | | | |
|---|---|---|---|
| بوونی ئێستایی | ئاوەکە | گەرمـ | ـە |
| بوونی بوونایەتی | ئاوەکە | گەرمـ | دەبێت |

لـه ئێرەشـدا، ڕێـژەکانی کـاری بـوونی بوونایـەتی تـەوەر دەبەسـتن لەسـەر واتـای (ئاوەڵناو ) یێكو چاوگێك چی دەکەن لە چەشنی (گەرم بوون). لـە ڕاسـتیدا، هـەردوو کاری بوونی ئێستایی(گەرمێتی)و بـوونی بوونایەتی(گـەرمبوون) دوو دیـون بـۆ یـەك (کار)، وەك:

**<u>دیوی یەکەم:</u>** له نموونەیەکدا، وەك: **(ئاوەکە گەرمـــە)**, ڕووداوی کارەکـە کاتخایـەن نیـەو وێنەیـەکی (وەستاو)پیشـان دەدات لـە (ڕەوش)ێکـدا، یـان لـە چرکەسـاتی (ترووکە)یەکدا، له چەشنی وێنەیەکی فۆتۆگرافی.

**<u>دیوی دووەم:</u>** له نموونەیەکدا، وەك **(ئاوەکە گەرم دەبێت)**, ڕووداوی کارەکە درێـژەی هەیـەو لەسـەر پەیـژەی (کـات) رادەخـر یـتـو فیلمێکـی ڤیـدیۆییو (جـووڵاو) پیشـان دەدات. هەر لەبەر ئەوە، نیشانەی نەرێ (نی) دەگۆڕێت، بە (نە)، وەك:

- بوونی ئیستایی (گەرمێتی) :

ئاوەکە گەرمـ (...) ـە

ئاوەکە گەرمـ ( نی) ـە

- بوونی بوونایەتی ( گەرمبوون):

ئاوەکە گەرمـ (...) دەبێت.

ئاوەکە گەرمـ نابێت

لە ڕێزمانی کوردیدا، لە ڕانەبردوودا هەردوو کۆلکەی (نە)و (دە) یەك دەگرنو دەبن بە (نا)، وەك (ئاوەکە گەرم نا بێت). لەلایەکی ترەوە، لە ئاستی کاری بوونی بوونایەتیدا، گشت چاوگێك کە بە ئاوەڵناو ڕۆنرابێت وەك ( گەرمبوون) لە دیوی تێپەڕدا دەبێت بە (گەرمکردن)، وەك:

جوان بوون: جوان کردن

سارد بوون : ساردکردن

تاڵ بوون : تاڵ کردن

ژیربوونەوە: ژیرکردنەوە

## ئەرکی چوارەم: چێ کردنی ناوی واتایی:

لە ڕێزمانی کوردیدا گشت ئاوەڵناوێك بۆی هەیە ناوی واتایی چێ بکات، بە ئەم شێوەیە:

- ئاوەڵناو دەتوانێت نیشانەی ناوی واتایی (ی) وەربگرێت، وەك:

جوان + ی : (جوانی)

پاك +ی : (پاکی)

ڕێك +ی : (ڕێکی)

سوور+ی : سووری

سارد +ی : ساردی

- ئاوەڵنـــاو دەتوانێـــت مـــۆرفیمی ئێســـتایی (ــە) و نیشـــانەی نـــاوی واتـــایی وەربگرێت، بۆ ئەوەی (چاوگ)ێك دروست بكات بۆ كاری بوونی ئێستایی، وەك :

جوان + ـە + ی : (جوانەتی، جوانێتی)

پاك + ـە + ی : ( پاكەتی ، پاكێتی)

ڕێك + ـە + ی : (ڕێكەتی ، ڕێكێتی )

سوور+ ـە + ی : (سوورەتی ، سوورێتی)

سارد + ـە + ی : (ساردەتی، ساردێتی)

- ئاوەڵناو بۆی هەیە پاشكۆی (ایی) وەربگرێت، بۆ خەست كردنـەوەی واتـای ئاوەڵناوێك لە جێیەكدا وەك:

تاریك + ایی : تاریكایی

باریك+ ایی : باریكایی

تەنك + ایی : تەنكایی

ئەستوور+ ایی : ئەستوورایی

سەوز+ ایی : سەوزایی

- ئاوەڵناو بۆی هەیە پاشكۆی(ایەتی) وەربگرێت، بۆ یداری كردنـی پەیوەنـدی لە نێوان كەسانی كۆمەڵگەدا، وەك:

خوشك + ایەتی : خوشكایەتی

باوك+ ایەتی : باوكایەتی

كورد + ایەتی : كوردایەتی

**<u>ئەركی پێنجەم: وەرگرتنی نیشانەی كۆ(ان)بۆ ناوی كەسان:</u>**

لە ئەو قوژبنە واتاییەدا، كە ئاوەڵناو تـوخمی (كەسـانی ژێـر) هەڵدەگرێت، نیشانەی كۆ(ان) دەچێتە سەر ئاوەڵناوەكە، وەك:

چاك: چاكان: كەسانی چاك

زانا: زانایان: كەسانی ز انا

**وریا: وریایان: کەسانی وریا**

**بلیمەت: بلیمەتان: کەسانی بلیمەت**

لەئەم نموونانەدا، ناتوانین بڵێین:

**کەسانی پاکان (*)**

**کەسانی بلیمەتان (*)**

بێگومان لە ئاستی ئاوەڵناوەکەدا ( پاك، بلیمەت) نیشانەی کۆ(ان) توخمی (کەس)و توخمی (کۆ)ی ڕێژتووە و نابێت لەهەمان دەستەواژەدا دووبارەیان بکەینەوە.

**ئەرکی شەشەم: چێ کردنی ئاوەڵناوی تەرخانکراو:**

ئاوەڵناو هەر لەسروشتەوە بریتیە لە (زایەنەر)ێکی بلیمەت بۆ زایاندنی وشەی نوێی لەژێر ناوی (ئاوەڵناوی تەرخانکراو). لە سەر نەخشەی (٨- ٢), ئاوەڵناوی (درێژ) بۆی هەیە چەندین ئاوەڵناوی تەرخانکراو چێ بکات.

| ئاوەڵناوی پەتی | ئاوەڵناوی تەرخانکراو |
|---|---|
| (......)درێژ← | ←(دەست)درێژ<br>←(دار)درێژ<br>← (گۆچان)درێژ<br>← (مل)درێژ<br>← (گوێ)درێژ<br>←(لاق)درێژ<br>← (لووت)درێژ<br>←(چیرە)درێژ<br>←(نووزە)درێژ... |

نەخشەی (٨- ٢): ئاوەڵناوی (درێژ) لە براقی تەرخانکردندا.

بێگومان، دەرگای ئەم میکانیزمە والآیە چی بەڕووی (ناو)ی کوردیداو چی بەڕووی وشەی بیانیدا، نەخشەی (٨- ٣).

| ئاوەڵناوی پەتی | ئاوەڵناوی تەرخانکراو |
|---|---|
| (......)درێژ← | ← (ئەریال)درێژ<br>← (شەفت)درێژ<br>← (شاسی)درێژ<br>← (وایەر)درێژ<br>← (دایس) درێژ ..... |

نەخشەی (٨- ٣): ئاوەڵناوی تەرخانکراو بە وشەی بیانی.

## ئەرکی حەوتەم: چێ کردنی دژ واتا:

ئاوەڵناو نیشانەیەکی تایبەتی خۆی هەیە لە چەشنی (نا) بۆ بەزەبری(نەرێنی) بەرانبەر بە (ئەرێنی)و وەك:

تەبا: ناتەبا، شاد: ناشاد

ڕێك : ناڕێك، خۆش: ناخۆش

پاك : ناپاك، ڕەوا : ناڕەوا

دروست : نادروست، بەجێ: نابەجێ

لەبار : نالەبار، کەس : ناکەس

پیاو :ناپیاو، شاز :ناشاز

ساز : ناساز، شارەزا : ناشارەزا...

بێگومان، ئەم میکانیزمە لەسەر گشت ئاوەڵناوێك ناگەڕێت، مەگەر لەسەر ئەوانەی کە دژواتایان هەیە، بۆ نموونە ئاوەڵناوی (پاك) دوو دژواتای هەیە(پیس) و

(ناپاك). لەباری یەکەمدا، جووت واتایی (تشتی پیس‌و تشتی پاك) دەچەسپێت، بەلاَم لەباری دووەمدا واتای (کەسی پاك‌و کەسی ناپاك) دەچەسپێت، بەواتای(پاکان‌و ناپاکان). لەلایەکی ترەوە، پێ دەچێت کە ئاوەڵناوی(نامۆ) لەدیوی نەرێدا بریتی بێت لە (مۆ)، وەك لە (دەستەمۆ)دا هەیە.

**ئەرکی هەشتەم: کورت کردنەوەی کۆمەڵەی (ناو):**

ئاوەڵناو بۆی هەیە بچێتە جێی (ناو)و شەبەنگی (ناو) وەربگرێت، وەك:

**(بەرد)(ێك) ی(بچووك)← بچووك (ێك)**

**(کەس)(ێك)ی(جوان)← جوان(ێك)**

بەپێی ئەم میکانیزمە، کە ڕێزمانی کوردی ڕێی داوە لە کورتکردنەوەی (کۆمەڵەی ناو)دا، ئاوەڵناو دەچێتە پێشەوەو بەرچاوی ڕێزماننووسان لێڵ دەکات وا دەزانن کە (ئاوەڵناو) ئەرکی سنتاکسی هەیە، هەر بۆ نموونە، دەگوترێت:

**بەردێکی بچووك بهێنە**

یان بەکورتی:

**بچووکێك بهێنە**

یان ، لە ڕۆڵی بکەردا:

**بەردێکی بچووك کەوتە خوارەوە**

یان، بەکورتی:

**بچووکێك کەوتە خوارەوە**

سەرەڕای ئەوەی گوترا، دەستەواژەی :

**(بەرد)(ێك)(ی) بچووك**

بۆی هەیە بگۆڕێت بۆ:

**(بەرد)(ێ) بچووك**

بەواتایەکی دی، دەستەواژەکە بۆی هەیە، چەند فۆرمێك وەربگرێت، وەك:

١-بەردێکی بچووك

٢-بەردێ بچووك(بەدرێك بچووك)

٣-بچووکێك

بە سەرنجێکی هورد لە کورت بوونەوەی ئەو دەستەواژەیە، دەردەکەوێت کە چۆن (کۆمەڵەی ناو) کرژ دەبێتەوەو هەندێك لە مۆرفیمەکان لادەباتو هەر هەموویان لەسەر (ئاوەڵناو) کۆ دەکاتەوەو ڕامانەکانیان دەپارێزێت. لە دەستەواژەی (بەردێ بچووك)دا، دیوێکی تر دروست بووە لە دەستەواژەی (بەردێکی بچووك)ەوە. لە ئەم هەڵسو کەوتەدا، هەر یەك لەئامرازی (ی)و لەدەنگی (ك) سووك کراون لە گۆکردندا، بەڵام واتاکەیان پارێزراوە.

**ئەرکی نۆیەم: چێ کردنی ئاوەڵگوزارە:**

ئەرکێکی تری(ئاوەڵناو) بریتیە لە چی کردنی (ئاوەڵگوزارە)ی شێواز وچۆنێتی ڕوودانی کاری نێو ڕستە. لە ئەم کردەوەیەدا، ئاوەڵناو بۆی هەیە سێ جۆر لە ئاوەڵگوزارە پێك بهێنێت، وەك:

**یەکەم**: بەیاریدەیی ئامرازی (بە) لەگەڵ ناوی واتایی، وەك:

**شیلان(بەجوانی )ئیش دەکات**

**دووەم**: بە بەکارهێنانی (ئاوەڵناو) بەڕاستەوخۆی وەك (ئاوەڵگوزارە)، وەك:

**شیلان (جوان) ئیش دەکات**

**سێیەم**: بە بەکارهێنانی ئاوەڵناوی دووبارە، وەك:

**شیلان (هێدی هێدی) نامە دەنووسێت**

## ٨- ٧- قەوارەی (ناو) و قەوارەی (ئاوەڵناو):

بۆ گەمارۆدانی کێشەی قەوارەی (ناو)و قەوارەی (ئاوەڵناو)، دەشێت چەند بنەمایەك دابڕێژین، وەك:

**بنەمای (١):**

**نیشانەی ناسیاوی (ەکە) هی قەوارەی (ناو)ە، نەك (ئاوەڵناو).**

**بنەمای (٢):**

**نیشانەی نەناسراوی (ێك) هی قەوارەی (ناو)ە ، نەك (ئاوەڵناو)**

**بنەمای (٣):**

**نیشانەی کۆ(ان) هی ئامرازی ناسراوی (ەکە)یەو هی ئامرازی ئاماژەیە، نەك هی (ناو).**

**بنەمای (٤):**

**قەوارەی (ئاوەڵناو) سەربەخۆ نیە و بریتیە لە خانیەك لە قەوارەی (ناو)دا.**

بۆ نموونە، ئەگەر گوترا:

**دارە جوانەکان**

چەند توخمێك لەئارادایە، وەك:

**دار: ە: جوان: ەکە: ان**

بەپێی بنەمای (١) نیشانەی ناسیاوی (ەکە) هی ناوەکەیە (دار)، وەك:

**دار..............ەکە**

بەپێی بنەمای (٣) نیشانەی کۆ(ان) هی نیشانەی (ەکە)یەو بە ڕێگای ئەم نیشانەیەوە گەیشتووە بە قەوارەی ناوی (دار):

**دار........ەکە - ان**

بەپێی بنەمای (٤)، قەوارەی (ئاوەڵناو) هی (ناو)ە، وەك:




**بنەمای (٥) :**

دەشێت قەوارەی (ئاوەڵناو) ناوێك هەڵ بگرێت لە نووكەوە ببێت بە ئاوەڵناوی تەرخانكراو، وەك:

جوان: گوڵ جوان : داری ( گوڵجوان)

بە ئەم پێیە دەشێت قەوارەی (ناو) ئاڵۆز تر بكەین، وەك:




**بنەمای (٦) :**

قەوارەی (ناو) دەشێت بترنجێتە نێو قەوارەی ئامرازی ئاماژەوە، نەخشەی (٨-٤).:




نەخشەی (٨-٤): تێكهەڵكێشبوونی قەوارەكانی (ئاوەڵناو, ناو, ئامرازی ئامازە).

لە قەوارەی ئامرازی ئاماژەدا، نە نیشانەی(کۆ)و نە نیشانەی نەناسراوی پەسەندین، چونکە ئامرازی ئاماژە لە ڕەسەنەوە توخمی (ناسراوی)و نیشانەی کۆی خۆی هەیە.

## ٨- ٨- سەلماندنی باری ئاوەڵناوی:

بۆ سەلماندنی باری ئاوەڵناوی پەنا دەبەین بۆ ئەندازەکانو ئەو ئاوەڵناوەی کە لێڵە دەی خەینە بەر شیکار. لە ئەم ڕووەوە، ڕوودەکەین لە نموونە تەمو مژدارەکان، وەك:

**نموونەی یەکەم:**

ئاوەڵناوی داڕێژراو بە ئامرازی (ی) بەرادەی (ناو)ێك، وەك (هەولێر).

ـئەندازەی یەکەم:

**جلی هەولێری : جل-هەولێری**

واتە: ئەو کەسەی کە جلەکەی هەولێریە.

ـئەندازەی دووەم:

**جلی هەولێری: جلە هەولێرییەکە**

هەر بۆ پڕاوە، تەنها یەکجار دەتوانین ئامرازی (ەکە) بەکاربهێنی.

ـئەندازەی سێیەم:

لە ئەندازەی دووەمدا ئامرازی (ی) وەرچەرخاوە بۆ (ـە).

ـئەندازەی چوارەم:

**جلی هەولێری: ئەو جلە هەولێرییە**

ئامرازی نیشانە(ئەو....ە) ئامرازی (ی) گۆڕیوە بۆ (ـە)

ئەندازەی پێنجەم:

**هەولێری + ان ← هەولێریان**

ئاوەڵناوی هەولێری نیشانەی کۆ (ان)ی وەرگرتووە، بۆ (کەسان).

ئەندازەی شەشەم:

**هەولێری + (ی) - هەولێری - ناوی واتایی**

وەك دەگوترێت:

**شیلان بەهەولێری قسەدەکات**

ئەندازەی حەوتەم:

**شیلان هەولێرییە**

لە ئێرەدا، ناتوانین بڵێین:

**شیلان بریتیە لە هەولێری (*)**

چونکە وشەی هەولێری ئاوەڵناوەو (ناو )نیە

ئەندازەی هەشتەم:

لە ئاستی ئاوەڵناوی (هەولێری)دا، ئەندازەی هەشتەم بە جوانی ناچەسپێت.

ئەندازەی نۆیەم:

**شیلان هەولێریترە لە ئازاد**

یان :

**لە نێو ئێمەدا، هەولێریترین کەس شیلانە**

ئەندازەی دەیەم:

**کەسێکی هەولێری**

دەبێت بە:

**کەسێ هەولێری**

یان :

**هەولێرییەك**

**نموونەی دووەم:**

ئاوەڵناوی داڕێژراو بە پاشکۆی(اوی) وەك:

(دەرداوی، بەرداوی، هەڵامەتاوی، سابووناوی، نەوتاوی، قوڕاوی، گڵاوی، خۆڵاوی، شاخاوی، وركاوی، هۆكاوی، بەزماوی، چێشتاوی، گریساوی، ڕۆناوی، میزاوی،

ماستاوی، ئارەقاوی، لیکاوی، چڵکاوی، کوڵکاوی، تووکاوی، ئاگراوی، تەلیسماوی،......)

لە ئەم جێیەدا، تەنها نموونەی (خۆڵاوی) وەردەگرین، وەك:

-ئەندازەی یەکەم:

**جلی خۆڵاوی: جل خۆلاوی**

·(واتە ئەو کەسەی کە جلەکەی خۆڵاوییە)

-ئەندازەی دووەم:

**جلی خۆڵاوی: جلە خۆڵاوییەکە**

واتە, تەنها یەکجار نیشانەی (ەکە) دەچەسپێت.

-ئەندازەی سێیەم:

لە ئەندازەی دووەمدا، ئامرازی (ی) بووە بە(ـە)

-ئەندازەی چوارەم:

**جلی خۆڵاوی: ئەو جلە خۆڵاوییە**

**ئامرازی ئاماژە ئامرازی (ی) کرد بە (ـە).**

-ئەندازەی پێنجەم:

**خۆڵاوییان: ئەو کەسانەی جلیان خۆڵاوییە**

-ئەندازەی شەشەم:

ئەم ئەندازەیە بە جوانی ناچەسپێت.

-ئەندازەی حەوتەم:

ئەندازەی حەوتەم دەچەسپێت، چونکە ناتوانین بڵێن:

**جلەکە بریتیە لە خۆڵاوی**

لەجیاتی

**جلەکە خۆڵاوییە**

ئەندازەی هەشتەم:

**جلەکەم خۆڵاوی دەبێت**

یان، لە باری تێپەڕدا:

**تۆ جلەکەی من خۆڵاوی دەکەیت**

ئەندازەی نۆیەم:

**جلەکەی شیلان خۆڵاویترە لە جلەکەی من**

یان

**شیلان خۆڵاویترین جلی لەبەرکردووە**

ئەندازەی دەیەم:

**جلێکی خۆڵاوی**

دەبێت بە :

**جلێ خۆڵاوی**

یان،

**خۆڵاوییەك**

وەك دەگوترێت:

**خۆڵاوییەك بهێنە**

لەجیاتی:

**جلێکی خۆڵاوی بهێنە**

نموونەی سێیەم:

لە ڕیزە ئاوەڵناوێکدا کە بە پاشگری (ـەم)و (ژمارە)یەك چی کراون، وەك( یەکەم، دووەم، سێیەم، چوارە، پێنجەم، ....) نەختێك لێڵیّ هەیە وەدەشێت بە گەزاقی ئەندازەکان (توخمی ئاوەڵناو) بناسرێتەوە. بۆ پرۆفە، ئاوەڵناوی (یەکەم) بە ئەم چەشنە دەناسرێتەوە:

ئەندازەی یەکەم:

ناوی یەکەم : (ناو یەکەم)

واتە، ئەو کەسەی کە ناوی یەکەمە لە ڕیزەکەدا، وەك:

ئایا ناو یەکەمەکە کێیە؟

ـئەندازەی دووەم:

ناوە یەکەمەکە

ـئەندازەی سێیەم:

لە ئەندازەی دووەمدا، ئامرازی (ی) بووە بە (ـە).

ـئەندازەی چوارەم:

قوتابی یەکەم: ئەو قوتابیە یەکەمە

ئامرازی نیشانە ئامرازی (ی) گۆڕیوە، بۆ (ـە).

ـئەندازەی پێنجەم:

ئەم ئەندازەیە بە جوانی ناچەسپێت, چونکە دەستەواژەی (یەکەمەکان) برەوی زۆرترە لە دەستواژەی (یەکەمان).

ـئەندازەی شەشەم

یەکەم+ی ← یەکەمی

ئەمساڵ شیلانە بە یەکەمی دەرچووە

ـئەندازەی حەوتەم:

شیلان یەکەمە

ناتوانین بڵێین:

شیلان بریتیە لە یەکەم

ـئەندازەی هەشتەم:

شیلان یەکەم دەبێت

ـئەندازەی نۆیەم:

شیلان یەکەمترە

ئەگەر چەند کەسێك (یەکەم) بوونو شیلان بە (پۆینت)، یان بە بەراود، بەرزتر بوو.

-ئەندازەی دەیەم:

**کەسێکی یەکەم**

یان،

**کەسێ یەکەم**

یان،

**یەکەمێك**

## ٨- ٩- سەرچاوە زایەنەرەکانی ئاوەڵناو:

ئەگەر ڕووبکەین لە خەرمانی وشەی ئاوەڵناو، دەبینین کە نموونەکان جیاوازن لەیەکتری، چونکە هەندێکیان وشەی یەك مۆرفیمینو هەندێکی تریان بەئامرازێکی جۆکەر پەیدابووگن، یان، هەیە لەسەر کارێك رونراوەو هەیە لە ئاوەڵکاوەوە هاتووە. لە ئەم کۆپلەیەدا، ڕوودەکەین لە سەرچاوەکانی پەیدابوونی (ئاوەڵناو)و پۆلێنیان دەکەین، وەك :

**یەکەم**: ئاوەڵناوی ساغو پەتی، واتە ئەو وشانەی کەلەیەك(مۆرفیم) پێکهاتوون و بەڕوونیو بە ئاشکرایی هیچ نیشانەیەکی (ڕۆنان) هەڵناگرن، وەك:

**پاك، جوان، ژیر، گەلۆر، تەپۆ، بەرز، نزم، سارد، گەرم، فێنك،**

**مزر، ترش، قاڵ، خێرا، تیژ، کۆڵ، کول، پان، درێژ، ........**

**دووەم**: ئاوەڵناوی ناوی، ئەم جۆرە نموونەیە هەر لەیەك مۆرفیم پێك هاتووە، بەڵام بەدوو ڕووەوە، یان بە (دوو دیوی)، وەك:

| | |
|---|---|
| **منداڵ** | ١- ناو (دوو منداڵ، منداڵەکەی تۆ....) |
| | ٢- ئاوەڵناو( منداڵتر لە...، منداڵترین کەس، هەرە منداڵ) |

لە ڕاستیدا، زمانی کوردی نموونەی ئەم جۆرە (ناو)ەی زۆرە، کە ناکارێکی ئاوەڵناوی هەڵ دەگرن و پردێك دروست دەکەن لەنێوان دوو دوورگەی دووبەشە ئاخاوتندا، کەبریتین لە توخمی(ناو)و توخمی (ئاوەڵناو).

**سێیەم**: ئاوەڵناوی ئاوەڵکاری، واتە ئەو ئاوەڵناوەی کە لە ڕەسەندا لە بەشە ئاخاوتنی (ئاوەڵکار)دایە، بەڵام لە بەکارهێناندا توێژاڵێکی (ئاوەڵناوی) لەخۆ گرتووە، وەك:

| | |
|---|---|
| زوو | ١- ئاوەڵکار (هێشتا زووە، زوو هاتیت....) |
| | ٢- ئاوەڵناو( زووتر، بە زووترین کات، بەزوویی) |

لەلایەکی ترەوە، هەردوو ئاوەڵناوی (زوو: درەنگ) دژواتا چێ دەکەن.

**چوارەم**: ئاوەڵناوی ئامرازی ، لە ئەم پۆلەدا هەردوو ئامرازی (لە) و (بە) ڕۆڵی خۆیان هەیەو (ئاوەڵناو) چێ دەکەن، وەك:

- ئامرازی (بە):

**بەهێز، بەڕێز، بەپێز، بەسۆز، بەکەڵك، بەجۆش، بەناز، بەکوڵ بەکەڵ، بەمەکر، بەدەم، بە برِشت، بەکار،......**

- ئامرازی (لە):

**لەپێش، لەدوا، لەپاش، لەناو، لەدەر، لەلا، لەژێر، لەسەر، .**

ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە دوو بەشە ئاخاوتنی جیاواز، ئامرازی پەیوەندی (لە)و ئاوەڵکار(پێش، دوا، پاش، ...) یەك دەگرن و خۆ دەگەیەنن بە بەشە ئاخاوتنێکی تر، کە ئاوڵناوە، نەخشەی (٨- ٥).

| ئامراز | ئاوەڵناو | ئاوەڵکار |
|---|---|---|
| (لە) | (لەپێش) | (پێش) |

نەخشەی (٨- ٥): ڕووبەی هاوبەش (ئاوەڵناو) لە نێوان (ئامراز و ئاوەڵکار).

بێگومان ئەم ڕاستیە خۆی لە خۆیدا، تشتێکی دەگمەنەو حەشارگەیە, چونکە دوو بەشە ئاخاوتنی جیاواز یەك دەگرن بۆ جێ کردنی بەشە ئاخاوتنی (ئاوەڵناو). لەگەڵ ئەوەدا، ئەم جۆرە ئاوەڵناوە حەز لە تەرخانکردن دەکات، وەك:

لەپێش: ڕوو لەپێش

لەپاش: ڕوو لەپاش

لەدەر: چاو لەدەر، ڕوو لەدەر

لەناو: لۆکە لەناو، چاو لەناو

لە دوا: چاو لە دوا

لەلا : دڵ لەلا

لەژێر: ئاگر لەژێر

لەسەر: چاولەسەر

پێنجەم: پێشگری (بێ) وەك جۆکەر دەچێتە سەر هەر (ناو)ێك و ئاوەڵناوێك جێ دەکات بۆ تشتێك یان کەسێك کە ئەو (ناو)ەی نیە. ئەم ئامرازە زۆر گشتیەو تەنانەت وشەی بێگانەو وشەی (بێ واتا) سەودا دەکات، وەك:

بێ جێ، بێ وەفا، بێ ماڵ، بێ خانوو، بێ ژن، بێ منداڵ، بێ بەقا، بێ وەچە، بێ نەوە، بێ کەس، بێ بەش، بێ کەلك، بێ ناز، بێ لاف، بێ گەزاف، بێ خەو، بێ دەم، بێ نەفس، .....

سەبارەت بە جیاوازی لەگەڵ ئامرازی (بە), لە نموونەیەکدا وەك ( بەهێزو بێ هێز)، ئامرازی (بێ) گشتیەو دەچێتە سەر هەر (ناو) ێك، بەڵام ئامرازی (بە) تایبەتیەو تەنها لە ئاستی بەشێك لە (ناو) بریشتی هەیە. واتە، ئامرازی (بە) ناتوانێت (دژواتا)ی تەواو بوەستێت لەگەڵ گشت نموونەکانی ئامرازی (بێ). بۆ نموونە, بەرانبەر بە(بێ کەس) و(بێ بەش) ناتوانین بڵێین (بەکەس و بە بەش*).

**شەشەم**: پاشگری (دار)، لەڕاستی دا، پاشگری (دار) دژواتای پێشگری(بێ) پڕ دەکاتەوە، وەك:

بێکەس: کەسدار, بێبەش: بەشدار

بێهێز: هێزدار, بێجێ: جێدار

بێکەلك: کەلکدار, بێپارە: پارەدار

ئەمەو، پاشگری(دار) زۆر زۆر بە پڕشتڕو کاریگەر ترە لە لە ئامرازی (بە)و بواری بەکارهێنانی زۆر ڕەوانترە.

**هەفتەم**: پاشگری (ـەر)، ئەم پاشگرە ڕۆڵێکی زۆر زۆر گرنگی هەیە لە وشەرۆناندا، لەسەر بنەمای مۆرفۆلۆژییانە، نەك لەسەر بنەمای مۆرفۆسنیتاکسی. بۆ نموونە، وشەی (نامە نووس)، یان (نامە نەنووس) کۆلکە سنتاکسیەکانی (نامە)و (نە) یان هەڵگرتووە، بەڵام وشەی (نووسەر) ناتوانێت ئەو کۆلکانە هەڵبگرێت، مەگەر پاشگری (ـەر) فرێ بدات. ئەمەو پاشگری(ـەر) چەند ئاکارێکی هەیە، وەك:

- توخمی (ئاوەڵناو) دەبەخشێت بە ئەو (ناو)ەی کە لەسەر (کار)ێك چێی دەکات، وەك:

نووسەر: نووسەران

: ئەو پیاوە نووسەرە

: پیاوە نووسەرەکە

- پاشگری (ـەر) بەڕاستەخۆیی دەلکێت بە بنجی ڕانەبردووی کاری (تێپەڕ)ەوە، نەك کاری (تێنەپەڕ). هەر لەبەر ئەو هۆیە شەبەنگی کارێکی (تێپەڕ) دەچێتە سەر وشە ڕۆنراوەکە.
- ئەگەر کارەکە (تێپەڕ) نەبوو، ئەوا بەکۆلکەی تێپەڕاندن(ێن) دەبێت بە (تێپەڕ). ئەوجا پاشگری (ـەر) دەچێتە سەر(ێن)و دەبێت بە (-ێنەر). بە واتایەکی دن، بەچاوگی (ئاندن) کارەکە دەبێت بە (تێپەڕ)و ئەمجار پاشگری

(ـەر) وەردەگرێت. کەواتە، لە ئاستی کاری (تێنەپەڕ)دا، پاشگرەکە دەچێتە سەر رەگی رانەبردووی چاوگی (ئاندن)، وەك:

سووتان ← سووتاندن ← سووتێنەر

- پاشگری (ـەر) بەڕاستەخۆیی دەلکێت بە بنجی کاری تێپەڕەوە، بەلام لەکاری (تێنەپەڕ)دا کۆلکەی (ێن) دەکەوێتە نێوانیان، وەك:

نووســـ : ....... : ـەر

سووتـــ : ێنـ : ـەر

- پاشگری(ـەر) رەهایەو جۆکەرەو کراوەیە بەرووی گشت کارێکی (تێپەڕ)دا، چی تێپەڕی بنجیو چی تێپەڕ بە چاووگی (ئاندن). لە ئەم ڕووەوە، ئەگەر نشوستی ڕێزمانی دەرکەوت، ئەوا ئەو لەنگییە دەگەڕێتەوە بۆ کارەکە خۆی نەك بۆ پاشگری (ـەر). بۆ نموونە، کارەکانی (ڕۆیشتن، چوون، هاتن،...) بەئاسانی نابن بە تێپەڕی (ئاندن) هەر لەبەر ئەوە بە ئاسانی ناتوانن پاشگری (ـەر) وەربگرن.

- پاشگری (ـەر) بەشێوەیەکی خۆڕسکی لەگەڵ ئەو کارانەدا بەکارهاتووە کەبنجەکەیان کورتە، وەك:

کردن : (کە) : بکەر

بردن : (بە) : ببەر

خستن : (خە) : بخەر

دان : (دە) : بدەر

(دا) نان : (نە) : (دا)نەر

خواردن : (خۆ) : بخۆر

تەنانەت بە دانانی پێشکاریش، ناتوانین پاشگری (ـەر) لاببەین، چونکە ئەو کورتییەی پڕکردووەتەوە کە لە بنجی ڕانەبردووی کارەکەدا هەیە:

بکەر : نەکەر : ئیش کەر

ببەر : نەبەر : نامەبەر

بخەر : نەخەر: ڕاخەر

بدەر : نەدەر : نان دەر

(دا) نەر: (دا)نەنەر: هەنگاو نەو

بخۆر : نەخۆر: بەرتیل خۆر

ئەم دیاردەیە، لە ئاستی کارەکانی تردا وانەبوو، چونکە بەشێوەی ڕۆنانی ئاسایی پاشگری (ـەر) یان وەرگرتبووە، بۆ نموونە وشەی(نووسەر)، وەك (نەکەر) و (ئیشکەر) نابێت بە:

نە نووسەر: نامە نووسەر

بەڵام دەبێت بە:

نەنووس : نامە نەنووس

واتە, واتە پاشگری (ـە) گشت کۆلکەکانی ڕستەسازی فڕێ دەدات ئەمجا دەچێتە سەر بنجی کارەکان. ئەمەش خۆی لەخۆیدا سەری حەشارگەیەك هەڵ دەداتەوە.

**هەشتەم: نیشانەی نەرێ (نە):**

لە زمانی کوریدا نیشانەی نەرێ(نە) بۆی هەیە کە (ئاوەڵناو) دروست بکات لەکارەوە، وەك (نەمر، نەگۆڕ، نەگر، نەدوو، نەبەز، نەترس، نەوێر، نەزان، نەنووس، نەسووت، نەکوڵ، نەناس، .....). هەندێك لە ئەم جۆرە ئاوەڵناوە دیوی ئەرێی هەیەو نیشانەی (بـ ) هەڵدەگرێت، وەك:

نەگۆڕ : بگۆڕ، یان نەوێر : بوێر

وەك لە ئەو نموونانەدا دەرکەوتووە، لە پێچەکانی نێو ڕێزمانی کوریدا، دیاردەی سەیرو سەمەرە هەیە، بۆ نموونە نیشانەی (نەرێ) بۆی هەیە( ئاوەڵناو) چێ بکات. بێگومان لە ئێرەدا، بێجی ئەو کارانە توخمی( ئاوەڵناو) هەڵ دەگرن‌و بە یاریدەی نیشانەی( نە) پتەو دەبن‌و بەرجەستە دەبن.

**نۆیەم:نیشانەی نەرێ:**

وەك لە خاڵی هەشتەمدا باسکرا, بە دیاردەی (تەرخانکردنی ئاوەڵناو), ڕەگی ڕانەبردووی کارە تێنەپەڕەکان دەتوانن کۆلکەی (بەرکار) وەر بگرن و ببن بە ئاوەلناوی تەرخانکراو, وەك (نامەنووس). هەروەها, دەتوانن نیشانەی نەرێ (نە) وەر بگرن وەك (نەنووس, یان نامەنەنووس).

**دەیەم: توخمی ئاوەڵناو لە ژمارەدا:**

لە زمانی کوردیدا، توخمی( ژمارە) توخمی (ئاوەڵناو) هەڵ دەگرێت بەشێوەیەکی زۆر خۆڕسك‌و دەگمەن، ئەم مۆرکە جوانەش زمانی کوردی جودا دەکاتەوە لە زمانانی تر وەك(ئینگلیزی، فەڕەنسی، عەرەبی،..).

**یەکلا، یەکڕوو، دووسەر، دوولۆ، ڕووبەر، سێگۆشە، سێکوچکە، سێبەهار، سێساڵ، سێپا، چوارگۆشە، چوارپێ، چوارلا، چوارشانە، چوارکەنار، چواردوگمە، پێنجلا، پێنجساڵ، شەشپاڵۆو، شەشلا، ......**

لە ئاستی ئەم نموونانەدا، دوو فاقی هەیەو جارێك ژمارەکە ڕووی (ژمارەیی) دەنوێنێت‌و جارێکی تر ڕووی (ئاوەڵناوی) دەنوێنێت، وەك:

| | |
|---|---|
| **سێساڵ** | ١- (٣)ساڵ، (سێ ساڵ لەمەوبەر) |
| | ٢- سێساڵ(ئاوەڵناو), (مندالّی سێساڵ) |

| | |
|---|---|
| **دووسەر** | ١- (٢) سەر، (دوو سەر مەڕ) |
| | ٢- دووسەر (ئاوڵناو)، (داری دووسەر) |

| | |
|---|---|
| چوارگۆشە | ١- (٤) گۆشە(هەر چوار گۆشەکە) |
| | ٢- چوار گۆشە (ئاوڵناو) ، (شێوەی چوارلایی) |

| | |
|---|---|
| دوولۆ | ١- (٢)لۆ، (دەزوووەکە دوو لۆی تێدا هەیە) |
| | ٢- دوولۆ، (ئاوڵناو) (ئەم دمزووە دوولۆیە) |

### ٨- ١٠- ئاوەڵناوی بێپەسن:

زاراوەی (ئاوەڵناو) یان بە ئینگلیزی (Adjective ) و بە فەرەنسی(Adjectif) ڕووبەڕێکی زۆری داپۆشیوەو چەندین پۆلە وشەڕێزمانی خراوەتە ژێر ڕکێفی ئەو زارەوەیە، وەك:

- ئاوەڵناوی نیشانە(ئاماژە)
- ئاوەڵناوی گەیەنەر
- ئاوەڵناوی ژمارەیی
- ئاوەڵناوی پرسیار....

لە ڕێزمانی فەرەنسیدا، ئیشێکی زۆر جوان ئەنجام دراوەو هێڵی سووری سنوور کێشراوە لەنێوان دوو زاراوەدا، وەك:

**یەکەم:** ئاوەڵناوی پەسەندار، یان (Adjectifs qualitatifs):

واتە ئاوەڵناوی پەتیو پتەو ئەو ئاوەڵناوی کە (پەسن)ێك دەبەخشێت بە ئەو کەسەی یان بۆ ئەو تشتەی کە بۆی دەگەڕێتەوە، وەك:

١-ئاوەڵناوی ڕەنگ( ڕەش، سپی، .....)

٢-ئاوەڵناوی خێرایی( خێرا، هێواش، ....)

٣-ئاوەڵناوی تەمەن، (هەراش، ساوا،...)

٤-ئاوەڵناوی ئاکاری فیزیاوی، (پان، تیژ، ...)

٥-ئاوەڵناوی زایەندی، (نێر، مێ، پیر، ...)

٦-ئاوەڵناوی چێژو تام، (ترش، مزر، شیرین، ....)
٧-ئاوەڵناوی هۆشەکی، (زانا، زیرەك، گەمژە، .....)
٨-ئاوەڵناوی چەندێتی، (کەم، زۆر، ....)
٩-ئاوەڵناوی خزمایەتی( برا، خۆشك، ....)
١٠-ئاوەڵناوی پلەی گەرما( سارد، گەرم، .....)

دووەم: ئاوەڵناوی بێ پەسن، یان (Adjectifs non qualitatifs): ئەم جۆرە وشەیە بە (دیارخەر) یان (Deteminants) ناسراون، بەلام هێشتا زاراوەی (ئاوەڵناو)یان بۆ بەکار دەهێنرێت. لە ڕێزمانی کوردیدا، هەندێك لە وشە ڕێزمانیەکان تووش کراون بە ئەم زاراوەیەوە، وەك:

-ئاوەڵناوی نیشانە
-ئاوەڵناوی گەیەنەر
-ئاوەڵناوی پرسیار، ....

لە نیشەکانی ئێمەدا، نە زاراوەی (ئاوەڵناو)و نە زاراوەی (ئاوەڵناوی بێ پەسەن) بەکارهێنراوە، چونکە بەهیچ جۆرێك جۆرە وشەی ئاوها بە (ئاوەڵناو) ناناسین. کەواتە, تەنهاو تەنها هەر ڕوو دەکەین لە ئاوەڵناوی (پەسندار).

**٨- ١١- ئاوەڵناوی پێچەوانە:**

بە سەرنجێکی هورد لە واتای (ئاوەڵناو)، پێدەچێت کە ئاوەڵناوەکان ( جووت) چێ دەکەن، چونکە (دژواتا) پەیدا دەبێت، وەك:
یەکەم: جووت ئاوەڵناوی دژیەك، وەك:

زۆر : کەم, درێژ : کورت
سپی : ڕەش, ڕاست : چەوت
باش : خراپ, هێواش : خێرا
لەڕ : قەڵەو

دووەم: جووت ئاوەڵناو بەپشتگیری(نا)، وەك:

ڕەوا : ناڕەوا, ڕێك : ناڕێك

دروست: نادروست, خۆش : ناخۆش

هەموار : ناهەموار, لەبار : نالەبار

سێیەم: جووت ئاوەڵناو بەدوو ڕەگەزی ڕێزمانی دژیەك، وەك:

بەهێز : بێ هێز, بەکەڵك: بێ کەڵك

بەڕێز : بێ ڕێز, بەناز: بێ ناز

بەپرشت: بێ پرشت

یان،

هێزدار: بێ هێز, کەلکدار : بێ کەلك

ڕێزدار : بێ ڕێز, نازدار : بێ ناز

برشتدار : بێ برشت

چوارەم: جووت ئاوەڵناوی ناڕێك،وەك:

خاو : کولاو، برژاو

کاڵ : گەییو

ساغ : کەرتکراو

لە ئەم ئاوەڵناوانەدا، پەنا براوەتە بەر بەشە ئاخاوتنی (کار) بۆ پەیداکردنی دژواتای نموونەکان.

پێنجەم: ئەو ئاوەڵناوانەی کە دژواتایان کەمە، یان لێڵە، یان نیە، وەك:

خڕ، شەفتوول ، گێر ، لا کێشە، چوار گۆشە، سێ گۆشە، ..

شەشەم: دژواتا بە نیشانەی نەرێ (نە), وەك:

بگۆڕ : نەگۆڕ, بوێر : نەوێر, بکەر : نەکەر

## ٨- ١٢-جۆرەکانی ئامرازی بەستن (ی):

لە پەرێزی ڕێزمانی ئاوڵناودا، هەرکەسێك کە ئیشەکانی ئێمە بخوێنێتەوەو لێیان تێ بگات، دەگات بە ئەو ڕاستیەی کە ئێمە هێڵێکی سووری ڕێزمانیمان کێشاوە بۆ دوو جۆر لە ئامرازی (ی)، کە بریتین لە:

یەکەم جۆر: ئامرازی (ی) لەنێوان (ناو)و (ناو) دا، وەك:

(باخ)ی (شار), یان (دیوار)ی( بەرد)

دووەم جۆر: ئامرازی (ی) لەنێوان( ناو)و (ئاوەڵناو)دا، وەك:

(باخ)ی( سەوز), یان (دیوار)ی (پان)

لە ئەو دوو جۆرەدا, ئامرازی (ی) دوو مزاری ڕێزمانی سەرەدەری دەکات، کەبریتین لە (ناو) و لە (ئاوەڵناو), وە هەریەك لەئەم دوو مزارە هوردەکاری خۆی هەیە. لە گشت نووسینەکاندا، ریزێك لە ئەندازەو پێوانە بەکارهێنراون بۆ ناسینەوەی توخمی(ئاوەڵناو) لە توخمی (ناو)و لە دوو توێ ئەم نووسینەشدا، ئەو ئەندازانە لە چەند جێیەکدا دووبارەکراونەتەوە. لە ئەم ئاستەدا، ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە هەنگاوێکی دن بچینە نێو کرۆکی بابەتەکەوە. لە ئەم ڕووەوە، جیاوازییەکی بچووك دەردەکەوێت لەنێوان هەردوو نموونەکەی جۆری یەکەمدا، وەك (باخی شار) کە بۆی نیە ببێت بە :

(باخ)ە (شار)ەکە (*)

ئەو (باخ)ە (شار)ە(*)

کەچی, نموونەکەی تر، بۆی هەیە کەببێت بە:

(دیوار)ە( پان) ەکە

ئەو ﴿ (دیوار)ە(پان)﴾ە

## ٨- ١٣- لە بەرئەنجامدا:

- گشت ئاوەڵناوێك خانەیەکی بۆش (-) هەڵ دەگرێت لە بەراییداو بارگەی ئەو خانەیە بریتیە لە (ناو)ێك کەئاوەڵناوەکەی پێ تەرخان دەکرێت، وەك (لووتباریك)، (کراسسوور)، (دەمبچووك)، (گوڵمۆر)، (چاوشۆڕ)، (سەربەرز).
- بڕاڤی (تەرخانکردنی ئاوەڵناو) دەشێت بکرێت بە پێوانەو ئەندازە بۆ

ناسینەوەی جۆرەکانی (ئاوەڵناو).

- لە بزاڤی (تەرخانکردنی ئاوەڵناو)دا، هیچ ئامرازێك یان هیچ گەردیلەیەکی ڕێزمانی ناکەوێتە نێوان کلکی ناوەکەو نووکی ئاوەڵناوەکە.
- لەبەر ئەوەی ئامرازی ناساندن (ەکە)، دەگەڕێتەوە بۆ بەشە ئاخاوتنی (ناو) نەك (ئاوڵناو)، دەشێت چەند جارێك بەکار بهێنرێت بەپێی ژمارەی ناوەکان.
- ئامرازی بەستن(ی) لە دەستەواژەی (ناو: ئاوەڵناو)دا جودایە لە هەمان ئامراز لەدەستەواژەی ( ناو: ناو)دا، چونکە بەزەبری ئامرازی (ەکە)و ئامرازی نیشانە دەگۆڕێت بۆ (ە).
- بەپێی ناوەڕۆکی خاڵی پێشوو، دەشێت ئامرازی ناساندن(ەکە)و ئامرازی نیشانە بەکاربهێنرێن وەك پێوانەو ئەندازە بۆ ناسینەوەی ئاوەڵناو.
- لە قەوارەی (ناو)دا، خانەیەك هەیە لە کلکەوە، بۆ بارکردنی (ئاوەڵناو) بەئامرازی (ی). ئەم خانەیە دەکەوێتە نێوان( ناو)ەکەو ئامرازی ناساندن (ەکە).
- لە دەستەواژەی (ناو: ئاوەڵناو)دا، ئامرازی نەناسراوی دەگەڕێتەوە بۆ (ناو)ەکە، وەك (پیاوێکی قەڵەو). ئەم جۆرە دەستەواژەیە بۆی هەیە کورت ببێتەوە, وەك:

**(پیاوێکی قەڵەو)؛ (پیاوێ قەڵەو)؛ (قەڵەوێك)**

- لە ئاستی ئاوەڵناوی کەسییدا، گشت ئاوەڵناوێك بۆی هەیە نیشانەی کۆ(ان) وەربگرێت.
- ئاوەڵناو بریتیە لە چینی بنەڕەت بۆ (ناوی واتایی).
- لەدەستەواژەی (ناو : ئاوەڵناو)دا، نابێتو ناشێت دەستەواژەی (بریتی بوون لە ....) بەکاربهێنرێت.
- هەندێك (ناو)ی زمانی کوردی، دیوی ئاوەڵناوی هەیە، وەك( منداڵ، دایك، ژن، کچ، پیاو....).
- ئاوەڵناو بۆی هەیە ببێت بە (پاڵپشت) بۆ کاری (بوونی ئێستایی).

- ئاوەڵناو بۆی هەیە ببێت بە (پاڵپشت) بۆ کاری بوونی بوونایەتیو دیوە تێپەڕەکەی (کردن)، وەك:

**(جوان) بوون( تێنەپەڕ) : جوان کردن (تێپەڕ)**

- ئاوەڵناو پلەی بەراوردی هەیە بەئامرازی (– تر، – ترین، هەرە —).
- لەئاستی ئەو ئاوەڵناوانەدا کە دژواتایان نیە نیشانەی نەرێ (نا) برەوی هەیە،
- لە ئاستی ئەو ئەندازانەدا کە لەم نووسینەدا بەکارهێنراون، هەر ئەندازەیەك گەزافی خۆی هەیە بەسەر ئەو ناوانەدا کە بۆیان هەیە لەجێی (ئاوەڵناو) دابنیشن.
- ئاوەڵناو بۆی هەیە پەسنی(ناو)بکات، وەك (ئاسمانی شین، دەزووی باریك، مرۆڤی سەلار، ....).
- ئاوەڵناو بۆی هەیە بەسێ جۆر رووبکات لە ئاوەڵگوزارە، وەك:

-لەگەڵ ئامرازی (بە) ، وەك:

**شیلان بە هێواشی دەڕوات**

-بەڕاستەوخۆیی، وەك:

**شیلان زۆر (هێواش) دەڕوات**

-بە دووبارەبوونەوە، وەك:

**شیلان (هێواش هێواش) دەڕوات**

- هەندێك جار، ئامرازێك وەك (لە) و(ئاوەڵکار)ێك یەك دەگرنو توخمی (ئاوەڵناو) پێك دەهێنن، وەك (لەدەر: چاو لەدەر).

- توخمی (ژمارە)یش بۆی هەیە کە ئاوەڵناو دروست بکات وەك ( دووسەر، دووڕوو، سێگۆشە، شەشلا، دوولۆ...)
- لە ئاستی ئیشەکانی ئێمەدا، ئاوەڵناوی (بێ پەسن)، وەك ( ئاوەڵناوی نیشانەو ئاوەڵناو گەیەنەرو ئاوەڵناوی پرسیار، ....) بەهیچ جۆرێك لەگەڵ (ئاوەڵناو)دا ڕیز ناکرێت.

- پێدەچێت کە بنجی ڕانەبردووی (کار) توخمی ئاوەڵناوی تێدا هەبێت، چونکە بە بارکردنی کۆڵکەکانی سنتاکسی وەك نیشانەی نەریٚ (نە) دەبێت بە وشەیەکی رۆنراو، کە توخمی ئاوەڵناو هەڵدەگرێت، وەك (نەگۆڕ، نەگر، نەمر، نەسووت، نەبەز، ....).
- وەك: چۆن (ئاوەڵناو) بزاڤی تەرخانکردنی هەیە بۆ (ناو)، هەر ئاوهایش، ئەو وشانەی کە لە کارەوە رۆدەنرێن بۆیان هەیە کە خانەی کۆلکەی (بەرکار) پڕبکەنەوەو بزاڤی (تەرخانکردن) بخەنەسەری، وەك (جل نەگۆڕ، دارسووتاو، ماڵ سووتێنراو).

---

گۆڤاری K.21, ژمارە (٤/٢٠٠٩).

## سەرچاوە:

کەلکی ڕاستەوخۆ وەرگیراوە لە ئیشەکانی خۆمان، وەك:

- ئامرازی ناساندن (مکە)، گۆڤاری پەیامی مامۆستا، ژمارە (١٦)، هەولێر ٢٠٠٠.
- چەند بابەتێکی بلاو نەکراوە لەسەر ڕێزمان ئەوەڵناو و ڕێزمانی ناوی واتایی.
- لە مۆرکە ڕەسەنەکانی ڕێزمانی کوردی، هەولێر، ٢٠٠٠.
- ڕامانێك لە ئاستی ناوی واتایی لە زمانی نووسیندا، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (٧٥)، هەولێر، ٢٠٠١.
- واتای گشتی، واتای تایبەتی، واتای خوازراو، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (١٨)، هەولێر ٢٠٠١.
- د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی سێیەم (ئاوەڵناو)، بەغدا ١٩٩٢.
- لێژنەی زمان و زانستەکانی، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٦.
- د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ئاوەڵناو بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆ، گۆڤاری(ڕۆشنبیری نوێ) ژمارە (١١٨) بەغدا، ١٩٨٨.
- د. کوردستان موکریانی، ئاوەڵناو لەڕستەی کوردیدا، بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی خواروو و کرمانجی ژووروو، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە( ٥) سالی ١٩٨٣.
- محەمەد مەعروف فتاح، هەندێك تێبینی دەربارەی ئاوەڵناو لە کوریدا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە ( ١٢٥) بەغدا، ١٩٩٠.
- محەمەد مەعروف فتاح، باس لە جۆرێك لە ڕستەی زمانی کوردیدا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ) ژمارە، (١٢٨) بەغدا، ١٩٩٢.
- د. ئەورەحمانی حاجی مارف، کورتە هەڵسەنگاندنێکی شەش کار لە لێکۆڵینەوەی ئاوەڵناودا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ) ژمارە، (١١٧)، بەغدا، ١٩٨٨.
- سەلام ناوخۆش، زمانناسی و هەندێك بابەتی زمانناسی کوردی، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٢٢-٣٣) هەولێر، ٢٠٠٤.
- محەمەد غەریب جودە، الموسوعە الشاملە والمعاصرە فی قواعد اللغە الانگلیزیە، مکتبە ابن سینا، القاهرە، ٢٠٠٥.
- نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، چاپخانەی کامەران، سلێمانی ، ١٩٦٠.
- د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی، بەغدا ١٩٧٥.
- د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ئاوەڵکردار و جۆرەکانی ئاوەڵکردار لە ڕووی ڕۆنانەوە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوی). ژمارە (١٢٧) بەغدا ١٩٩١.

- ئاوەڵناو و ئاوەڵکار لە زاری کەڵهوڕی–دا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٢١)، بەغدا ١٩٨٩.
- د. نەسرین فەخری، لیکسیکۆلۆژیا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوی)، ژمارە (١١١)، بەغدا ١٩٨٦.
- مەسعوود محەمەد، زاراوە سازی پێوانە، بەغدا ١٩٨٨.
- د. محەمەد مەعرووف فەتاح، زمانەوانی زانکۆی سەلاحەدین ١٩٨٧.
- د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، بەشی یەکەم (ناو) بەغدا (١٩٧٩).
- د عبدالرحمن ایوب، الكلام انتاجه و تحليله، الكويت ١٩٨٤.
- **J . Aitchison, *linguistics*,Hodder and stoughtonU. K 1992.**
- **P.Hopper, English verbs, barons educational Series, USA 1991.**
- **Bescherelle 3. La grammarie pour tous, HATIER, Paris 1990.**
- **M. Swan et F. Hourquin, Pratique de langlais de A a Z, HATIER, Paris 1983.**

# کتێبە چاپکراوەکانی نووسەر لە بواری زمانی کوردیدا

١- ڕستە سازی و شیتەڵکاری زانستی هەولێر ١٩٩٦.

٢- میکانیزمە بنەڕەتیەکانی ڕستەسازی، هەولێر ١٩٩٧.

٣- دانامیزمی جێناوی لکاو لە ڕستەسازیدا، هەولێر ١٩٩٧.

٤- نەخشەی ڕۆنانی ڕێژەی کار، هەولێر ١٩٩٩.

٥- لە مۆرکە ڕەسەنەکانی ڕێزمانی کوردی ، هەولێر ٢٠٠٠.

٦- بەرەو ڕێزمانی کوردی : بەرەو زمانی نووسین، هەولێر ٢٠٠٠.

٧- شرۆڤەکاری ڕێزمانی لە زمانی نووسیندا، هەولێر ٢٠٠٠.

٨- ڕێزمانی پاشگری دووپاتی (ـەوە) ، هەولێر ٢٠٠١.

٩- ڕێزمانی کەسی سێیەمی تاک، هەولێر ٢٠٠٤.

١٠- دەنگسازی و بڕگەسازی، هەولێر ٢٠٠٥.

١١- مۆرفیمی نێستایی (ـە) ، هەولێر ٢٠٠٦.

١٢- زمانی نووسینی ڕێزماندار، هەولێر ٢٠٠٨.

١٣- بەرەو وشەرۆنان لە زمانی نووسیندا ، هەولێر ٢٠٠٨.

١٤- هەندێك لە ئاکارە ڕەنگینەکانی ڕێزمانی کوردی، هەولێر ٢٠٠٨.

١٥- ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی لە ئاستی زمانی نووسیندا ، هەولێر ٢٠٠٩.

١٦- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠٠٩ ( نوسینەوەی یەکەم).

**The Phonemic Junction Faculty**

١٧- بەرەو زانستی دەنگسازی لە ئاخاوتنی کوردییەوە، سلێمانی ٢٠١٠.

١٨- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٠. (نووسینەوەی دووەم، پێداچوونەوە و نۆژەنکردنەوە).

**The Phonemic Junction Faculty, 2nd edition**

١٩- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٠.

**Engineering Phonology**

٢٠- سێ میکانیزمی ڕێزمانی، دەزگای موکریانی، هەولێر ٢٠١٢.

٢١- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٣.

**Vowel Power Theory**

٢٢- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٣.

**Phonetic Engineering**

٢٣- ڕێزمانی کاری ئاسادە، هەولێر ٢٠١٤.

٢٤- ڕێزمانی ئاوەڵناو (ئەم کتێبەی بەردەست)، هەولێر ٢٠١٤.

## لیستی توێژینەوەکان لە بواری رێزمانی کوردیدا

١- جێ گۆرکێی جێناوی لکاو، رۆلی بکەر و بەرکار، گۆڤاری کاروان ژمارە (٢)، ١٩٩٢.

٢- بلاوکردنەوەی پوختەی پرۆژەی:

**Programmable Grammar of the Kurdish Language**

لە بلاوکراوەکانی زانکۆی ئەمستردام، پەیمانگای مەنتیق و زمان و کۆمپیوتەر، ژمارە (Lp-95-02)

٣- دەنگی خپ لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١١٦)، هەولێر ١٩٩٧.

٤- رێزمانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە)، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (٢٠)، هەولێر ١٩٩٨.

٥- برشتی خانە رێزمانییە بۆشەکان لە نێو بیردا،گۆڤاری (پەیامی مامۆستا)، ژمارە (٩)، هەولێر ١٩٩٨.

٦- رەگەزە رێزمانییە ستوونییەکان، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١١٨)، هەولێر ١٩٩٨.

٧- لێکدانەوەی رستە بە ژمارە، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (١)، هەولێر ١٩٩٨.

٨- پێنج پێشنیار بۆ زمانی رۆژنامەگەری، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٢٠)، هەولێر ١٩٩٨.

٩- چێوەی برگەی دەنگسازی، گۆڤاری (مەتین)، ژمارە (٧٦)، دهۆك ١٩٩٨.

١٠- جێناوی نادیار، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٣)، هەولێر ١٩٩٨.

١١- کۆلکە رێزمانییە دوو رەگەزەکان، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا) ، ژمارە (١٠)، هەولێر ١٩٩٨.

١٢-کێشەی کاری (هاویشتن) لە زمانی نووسیندا، گۆڤاری (مەتین)، ژمارە (٧٨)، دهۆك ١٩٩٨.

١٣- نامرازی پەیوەندی (ە) ، لە زمانی نووسیندا،گۆڤاری کاروان، ژمارە (١٢٢)، هەولێر ١٩٩٨.

١٤- خشتەی لێکدانی بزوێن ،گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٢٤)، هەولێر ١٩٩٨.

١٥- شێوەزاری گەرمیان بەبەراورد ، گۆڤاری (هاواری کەرکووك)، ژمارە (١)، هەولێر ١٩٩٨.

١٦- پانۆرامای مۆرفیمی ئێستایی (ـە)،گۆڤاری (پەیامی مامۆستا) ، ژمارە (١١)، هەولێر ١٩٩٨.

١٧- کێشەی روخساری جێناو، گۆڤاری (رواندز) ، ژمارە (٢)، هەولێر ١٩٩٨.

١٨- بەرەو زمانی نووسین: مەکینەی وشە رۆنان، گۆڤاری (رامان) ، ژمارە (٢٨)، هەولێر ١٩٩٨.

١٩- میکانیزمی وەرچەرخان، گۆڤاری (مەتین) ، ژمارە (٨١)، دهۆك ١٩٩٨.

٢٠- میکانیزم لە بزاڤی جێگۆرکێدا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٢٧)، هەولێر ١٩٩٨.

٢١- چەند نهێنییەك لە رێزمانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە)دا، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٦)، هەولێر ١٩٩٨.

٢٢- کێشەی جێناوی کەسی دووەمی تاك لە زمانی نووسیندا،گۆڤاری (مەتین) ، ژمارە (٨٣)، دهۆك ١٩٩٨.

٢٣- رێزمانی پاشکۆی (یەتی)، گۆڤاری (پەیف) ، ژمارە (٩)، دهۆك ١٩٩٨.

٢٤- کێشە و کەڵك لە رێزمانی کەسی سێیەمی تاکدا، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا) ، ژمارە (١٢)، هەولێر ١٩٩٨، ژمارە (١٣)، هەولێر ١٩٩٩.

٢٥- برگەی دووبارە لە زمانی نووسیندا، گۆڤاری (مەتین) ، ژمارە (٨٧)، دهۆك ١٩٩٩.

٢٦- رێزمانەکە خۆی خۆی راست دەکاتەوە، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٩)، هەولێر ١٩٩٩.

٢٧- نەخشەی دابەشبوون لە رێزمانی بوون و هەبووندا، گۆڤاری (هەڵەبجە)، ژمارە (١)، هەولێر ١٩٩٩.

٢٨- میکانیزمی زەبری بزوێن، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٣٢)، هەولێر ١٩٩٩.

٢٩- دوو رەگەزی رێزمانی بە بەراورد، گۆڤاری (هەڵەبجە)، ژمارە (٢)، هەولێر ١٩٩٩.

٣٠- ڕێژەی فەرمان، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا) ، ژمارە (١٤)، هەولێر ١٩٩٩.

٣١- پاشگری دووپات کردنەوە (موە)/ لە شیتەڵکاریدا، گۆڤاری (مەتین) ، ژمارە (٩٠)، دهۆك ١٩٩٩.

٣٢- گەمەیەك لە گەڵ ئامرازی (ی)دا، ڕۆژنامەی برایەتی ئەدەب و هونەر، ژمارە (١٤٠)، هەولێر ١٩٩٩/٨/٢٠.

٣٣- دەنگی کپ و دەنگی نیمچە کپ لە زمانی نووسیندا، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (١٠)، هەولێر ١٩٩٩.

٣٤- گەشتێك لە گەڵ جێناوی کەسی سێیەمدا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٣٦)، هەولێر ١٩٩٩.

٣٥- جێناوی لکاو بە بەراورد، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (٣٩)، هەولێر ١٩٩٩.

٣٦- تایبەتمەندێتی لە ڕێزمانی بوون و هەبووندا، گۆڤاری (بیاڤ)، ژمارە (٢)، هەولێر ١٩٩٩.

٣٧- ئامرازی بار و سەربار " ی"، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا) ، ژمارە (١٥)، هەولێر ١٩٩٩.

٣٨- لە ئەلبوومی خلیسکەبزوێندا، گۆڤاری (پەیڤ) ، ژمارە (١٢)، دهۆك ١٩٩٩.

٣٩- جەبر و ڕێزمانی کوردی، ڕۆژنامەی برایەتی ئەدەب و هونەر، ژمارە (١٤٨)، هەولێر ١٩٩٩/١٠/١٥

٤٠- واتاسازی لە پاشگری ( موە)دا، گۆڤاری ( ڕۆشتبیری کوردستانی)، ژمارە (١)، هەولێر ١٩٩٩.

٤١- لە پەراوێزی مۆرفیمی ئێستاییدا، گۆڤاری (هەڵەبجە)، ژمارە (٣)، هەولێر ١٩٩٩.

٤٢- گرێی دەنگسازی، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٣٩)، هەولێر ١٩٩٩

٤٣- ڕێزمانی ئامرازی گەیێنەر، ڕۆژنامەی برایەتی ئەدەب و هونەر، ژمارە ( ١٥٧ )، هەولێر ١٩٩٩.

٤٤- ئامرازی ئاماژە و ئامرازی گەیێنەر، گۆڤاری (مەتین) ، ژمارە (٩٥)، دهۆك ١٩٩٩.

٤٥- ئامرازی ناساندن (مکە)، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا)، ژمارە (١٦)، هەولێر ٢٠٠٠.

٤٦- پلەی پۆلە جێناوەکان، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٤٢)، هەولێر ٢٠٠٠.

٤٧- گەشتێك بە ناو واتای کاری سووتاندا، گۆڤاری ( ڕۆشتبیری کوردستانی)، ژمارە (٢)، هەولێر ٢٠٠٠.

٤٨- گەمەیەك لەناو ئامرازەکانی ناساندندا، ڕۆژنامەی برایەتی ئەدەب و هونەر، ژمارە (١٧٣)، هەولێر ٢٠٠٠.

٤٩- ڕوخسارەکانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) ، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (١٣)، هەولێر ٢٠٠٠.

٥٠- گەمەیەك لە گەڵ مۆرفیمی بۆشدا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٤٤)، هەولێر ٢٠٠٠

٥١- بنجایەتی لە هێزی تێپەڕیندا، ڕێزمانی بنەڕەت، گۆڤاری (رامان) ژمارە ( ٤٧)، هەولێر ٢٠٠٠.

٥٢- گەمەیەك لەگەڵ ئامرازی ئاماژەدا، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا)، ژمارە (١٧)، هەولێر ٢٠٠٠.

٥٣- دۆخەکانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە)، گۆڤاری (مەتین)، ژمارە (١٠١)، دهۆك٢٠٠٠.

٥٤- جێناوی سادە و جێناوی ناسادە، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (٥٠)، هەولێر ٢٠٠٠.

٥٥- تایبەتمەندی لە جێناوی کەسی سێیەم دا، ڕۆژنامەی (برایەتی ئەدەب و هونەر، ژمارە (١٩٠)، هەولێر ١٨/ ٨/ ٢٠٠٠.

٥٦- ڕێژەی ناناشکرا لە نیازداری و گوماندارىدا، گۆڤاری کاروان، ژمارە (١٤٨)، هەولێر ٢٠٠٠.

٥٧- نموونەیەك لە چاکسازی لە زمانی نووسیندا، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا)، ژمارە (١٨)، هەولێر ٢٠٠٠.

٥٨- بەرەو ڕێزمانی بڕگە ، گۆڤاری ( ڕۆشتبیری کوردستانی)، ژمارە (٣)، هەولێر ٢٠٠٠.

٥٩- دەنگی (ت) لە ڕوخساری جێناودا بە بەڵگە، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (٥٢)، هەولێر ٢٠٠٠.

٦٠- چەند نهێنییەك لە ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی(ـە)دا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٥٢)، هەولێر ٢٠٠٠.

٦١- ڕێژەی بکەر نادیار و چەند سەرنجێك، گۆڤاری(رامان)، ژمارە(٥٥)، هەولێر ٢٠٠٠.

٦٢- ئامرازی پەیوەندی(بۆ) لە چەند سەرنجێکدا، ڕۆژنامەی (برایەتی ئەدەب و هونەر، ژمارە (٢١٦)، هەولێر ٢٠٠١.

٦٣- ڕامانێك لەناستی ناوی واتایی لە زمانی نووسیندا، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (٥٧)،، هەولێر ٢٠٠١.

٦٤- سێ میکانیزم بۆ دەرکەوتنی مۆرفیمی ئێستایی (ـە)، گۆڤاری (مەتین)، ژمارە (١٠٩)، دهۆك ٢٠٠١.
٦٥- گەمەیەك لە نێو برگەی دەنگسازیدا، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا)، ژمارە (٢٠)، هەولێر ٢٠٠١.
٦٦- گەشتێك لە ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی دا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٥٥)، هەولێر ٢٠٠١.
٦٧- ڕێزمانی گەرستەی (هەر) بەلێکدراوی، گۆڤاری (یەکبوون)، ژمارە (١٧)، هەولێر ٢٠٠١.
٦٨- گەرستەی (هەر) لە شرۆڤەکاری ڕێزمانیدا، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (٥٩)، هەولێر ٢٠٠١.
٦٩- ئامرازی پەیوەندی لە ئاوەڵگوزارەدا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٥٧) ، هەولێر ٢٠٠١.
٧٠- رامانێك لە ئاستی خوێندنی ڕێزمان لە قوتابخانەکاندا، گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی)، ژمارە (٧)، هەولێر ٢٠٠١.
٧١- نابووت کردنی ئامرازی پەیوەندی لە زمانی رۆژنامەگەریدا، گۆڤاری (رۆژنامەوانی)، ژمارە (٥)، هەولێر ٢٠٠١.
٧٢- ئامرازی پەیوەندی (لە)، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٦٠)، هەولێر ٢٠٠١.
٧٣- گەشتێك لە نێو ڕێزمانی ئاوەڵناودا، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (٦٣-٦٤)، هەولێر ٢٠٠١.
٧٤- کەڵکی ئامرازی پەیوەندی (ـە) لە وانەی ڕێزماندا، گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی)، ژمارە (١٠)، هەولێر ٢٠٠١.
٧٥- واتای گشتی، واتای تایبەتی، واتای خوازراو، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (١٨)، هەولێر ٢٠٠١.
٧٦- ئامرازی پەیوەندی (بۆ) لەشرۆڤەکاری ڕێزمانیدا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٦٢)، هەولێر ٢٠٠٢.
٧٧- زمانی رۆژنامەگەری و هەڵسووراندنی هەواڵ، گۆڤاری (رروۆژنامەگەری)، ژمارە (٩)، هەولێر ٢٠٠٢.
٧٨- ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی (بە) ، گۆڤاری (مەتین)، ژمارە (١٢٦)، دهۆك ٢٠٠٢.
٧٩- کێشەی ڕێنووسی واوی درێژ، گۆڤاری ( رامان)، ژمارە (٧٩)، هەولێر ٢٠٠٣.
٨٠- مۆرفیمی ئێستایی لە ژێر جێناودا، بە بەرکاری لکاوتگە، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (٨١)، هەولێر ٢٠٠٣.
٨١- روخساری مۆرفیمی ئێستایی بە بەڵگە، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٣١)، هەولێر ٢٠٠٤.
٨٢- ئامرازی بەستن (ی) لە چەند گەمەیەکی شرۆڤەکاریدا، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (٨٦\٨٧)، هەولێر ٢٠٠٤.
٨٣- چەند ئەندازەیەك بۆ ناسینەوەی ئاوەڵناو، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٣٢)، هەولێر ٢٠٠٤.
٨٤- پانۆرامایەك بۆڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی ، گۆڤاری (ئەکادیمی)، ژمارە (٢)، دهۆك ٢٠٠٤
٨٥- ئاوەڵناو وەك کوانوویەك بۆ ناوی واتایی، گۆڤاری (پەیڤ)، ژمارە (٣١)، دهۆك ٢٠٠٤
٨٦- بەڵگەسازی و ئەندازەکاری لە ئاکارەکانی ئاوەڵناودا، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (٩٢)، هەولێر ٢٠٠٥
٨٧- کاری (کردن) بریتییە لە دیوە تێپەڕەکەی (بوونی رووداودار)، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٩٣)، هەولێر ٢٠٠٥
٨٨- گەشتێك بە نێو ڕێزمانی کاری (هەبوون)دا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٩٥)، هەولێر ٢٠٠٥.
٨٩- لە ئاکارە رەنگینەکانی ڕێزمانی کوردی، گۆڤاری (مێرگ)، ژمارە (٢)، هەولێر ٢٠٠٥.
٩٠- بوونی بێ رووداو بوونی رووداودار بەراورد، گۆڤاری (ئەکادیمی)، ژمارە (٣)، هەولێر ٢٠٠٥
٩١- حەشارگەی دەمکاتی ئایندە لە ڕێزمانی بوون و هەبووندا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٩٧)، هەولێر ٢٠٠٥.
٩٢- ڕێزمانی کاری (کردن) بۆ مامۆستایانی زمانی کوردی، گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی)، ژمارە (٥٨)، هەولێر ٢٠٠٥.
٩٣- جۆرەکانی (بوون) لە ژێر میکرۆسکۆپی لێکۆڵینەوەدا، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (١٠٢)، هەولێر ٢٠٠٥.
٩٤- تایبەتمەندی لە رەفتاری ئامرازی کۆ (ان)دا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٩٩)، هەولێر ٢٠٠٥.
٩٥- بزوێنی بزرۆکە /i/ بە بەرجەستەیی لە ڕێنووسدا، گۆڤاری (هزرین)، ژمارە (٢)، هەولێر ٢٠٠٥.
٩٦- پەندی (رەگ بە رەگێشە و گلێخە بە بنە تۆو ) لە تەرازووی زماندا، گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر)، ژمارە (١٦)، هەولێر ٢٠٠٦.

٩٧- ڕێچکەکانی ڕستەسازی لە کاری بوونی ئێستایی دا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٠٢)، هەولێر ٢٠٠٦.

٩٨- وشە ڕۆنان بە بێ ئامرازی ڕێزمانی ، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٣١)، هەولێر ٢٠٠٦.

٩٩- گەمەیەکی هورد و ئالۆز لە ڕێزمانی بوون و هەبووندا، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (١٠٧)، هەولێر ٢٠٠٦.

١٠٠- چەند سەرنجێك دەربارەی کاری بێهێز و کاری ناتەواو، گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی)، ژمارە (٦٤)، هەولێر ٢٠٠٦.

١٠١- گەشتێك بە ناو ڕێزمانی ئامرازی (نەرێ)دا ، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٣٢)، هەولێر ٢٠٠٦.

١٠٢- گەشتێك بە نێو ڕێزمانی چاوگی (ئاندن)دا ، گۆڤاری (پەیف)، ژمارە (٣٧)،دهۆك ٢٠٠٦.

١٠٣- واتادانەوەی کاری (شکان) لە ئاخاوتنی کوردەواریدا، گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر)، ژمارە (١٨)، هەولێر ٢٠٠٦.

١٠٤- چەبد وێستگەیەك لە ڕێزمانی ئاوەڵناودا ، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٠٥)، هەولێر ٢٠٠٦.

١٠٥- گەشتێك بە نێو ڕێزمانی کاری (دان)دا ، گۆڤاری (ئەکادیمی)، ژمارە (٤)، هەولێر ٢٠٠٦.

١٠٦- بوونی ئێستایی و مۆرفیمی ئێستایی بریتین لە کار بە بەڵگە و بە شرۆڤە، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (١٠٧)، هەولێر ٢٠٠٦.

١٠٧- سێتی ڕێزمانی وەك کەرەستەیەك بۆ فێرکردن لە وانەی ڕێزماندا، گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی)، ژمارە (٦٧)، هەولێر ٢٠٠٦.

١٠٨- پاشگری ناوی بکەر (ـەر) لە شرۆڤەکاریدا ، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٠٨)، هەولێر ٢٠٠٦.

١٠٩- گرنگی وشەی (خۆ) لە ڕێزماندا، گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی)، ژمارە (٦٩)، هەولێر ٢٠٠٦.

١١٠- مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە سێتی ڕێزمانیدا ، گۆڤاری ( نووسەری نوێ)، ژمارە (٣٢)، هەولێر ٢٠٠٦.

١١١- ئەرك و ڕیزی ئامرازی (ـە) لە ڕێزمانی کاردا، گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی)، ژمارە (٧٢)، هەولێر ٢٠٠٦.

١١٢- ئامرازی (ـە) لە ڕێزمانی کاری (هاتن)دا، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٣٥)، هەولێر ٢٠٠٦.

١١٣- ئامرازی (ـە) لە ڕێزمانی کاری (کەوتن)دا، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا)، ژمارە (٣٠)، هەولێر ٢٠٠٦.

١١٤- گرنگی (بەرکار) لە ئاستی ڕێزمانی کار و ڕێزمانی چاوگدا، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (١١٦)، هەولێر ٢٠٠٦.

١١٥- پۆلین کردنی تەرزسازییانەی زمانی کوردی، گۆڤاری (ئەکادیمی)، ژمارە (٥)، هەولێر ٢٠٠٧.

١١٦- ئامرازی (ـە) وەك ئامرازێکی پتەو لە ڕێزماندا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢١٣)، هەولێر ٢٠٠٧.

١١٧- ڕێزمانی پاشگری (ـەر) بە نموونە و بە شرۆڤە، گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی)، ژمارە (٧٥\٧٦)، هەولێر ٢٠٠٧.

١١٨- ئامرازی (بۆ) و ئامرازی (لەبۆ) بە شرۆڤە و بە بەراورد، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢١٦)، هەولێر ٢٠٠٧.

١١٩- دیوە تیۆرییەکانی ڕێزمانی بەرکاری ڕاستەوخۆ، گۆڤاری (ئەکادیمی)، ژمارە (٦)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٢٠- ماکەکانی شێوەزاری گەرمیان لە زمانی نووسیندا، گۆڤاری (نەوشەفەق)، ژمارە (٤٣)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٢١- کێشە دەنگسازییەکانی ئامرازی (ـە) لە ڕێزمانی کاردا، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٣٧)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٢٢- ئامرازی نیشانە لە چەند ئالۆزییەکی ڕێزمانیدا ، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا)، ژمارە (٣١)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٢٣- پاشگری ناوی بکەر (ـەر) پاشگری ناوی بەرکار (ڕاو) بە شرۆڤەو بە بەراورد، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢١٨)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٢٤- لە سیما جوانەکانی شێوەزاری گەرمیان، گۆڤاری (نەوشەفەق)، ژمارە (٤٦)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٢٥- کەرەستەی (هێ) و کەرەستەی (هین) لە شرۆڤەکاری ڕێزمانیدا، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٣٨)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٢٦- کاری ( بریتی بوون لە......) لە زمانی نووسیندا، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (١٣٥)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٢٧- کەرەستەی (تر) لە ڕوانگەی زمانی نووسینەوە، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٢٠)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٢٨- چەند سەرنجێکی زاراوەسازییانە، گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر)، ژمارە (٣٠)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٢٩- سۆراخێك بە دوای مۆرفیمی ئێستاییدا، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٣٩)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٣٠- ئاخاوتنی نێر-وزە لە شرۆڤەکاری زانستیدا ، گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر)، ژمارە (٣١)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٣١- هەندێك تایبەتمەندی دەنگسازییانە لە نیشانەکانی ڕابردوو "د" و "ت"دا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٢٣)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٣٢- وشەی ڕیزمانی و وشەی لێکسیکی، گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی)، ژمارە (٧٨)، هەولێر ٢٠٠٧.

١٣٣- نیشانەکانی ڕابردوو و نیشانەکانی جۆری ڕابردوو، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٤٠)، هەولێر ٢٠٠٨

١٣٤- گوڵبژێرێك لە وشە تایبەتییەکانی شێوەزاری هەولێر، گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر)، ژمارە (٣٣)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٣٥- هەندێك لە لە جۆرەکانی تێپەڕ لە شرۆڤەکاریدا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٢٦)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٣٦- ڕێساکانی وشەرۆنان لە بنجی کارەوە، گۆڤاری (ئایندە)، ژمارە (٧٨)، سلێمانی ٢٠٠٨.

١٣٧- ڕێزمانی ناو و لاڕێزمانی ئاوەڵناو لە تەرازووی بەراورددا، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٤١)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٣٨- ئامرازی پەیوەندی "بە" لە چەندین بەکارهێناندا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٢٩)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٣٩- کاری ئاراستەدار و کاری ئامرازدار لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری (نەوشەفەق)، ژمارە (٥٧)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٤٠- ئەلبوومێك بۆ نیشانەی کۆ "ان" لە ئاخاوتنی کوردیدا، گۆڤاری (پەروەردە و فێرکردن)، ژمارە (١)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٤١- کارەکانی دەنگی سروشتی لە ئاخاوتنی کوردیدا، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٤٢)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٤٢- ڕێزمانی ڕێژەی تێپەڕ لە شرۆڤەکاریدا، گۆڤاری (نەوشەفەق)، ژمارە (٦٠)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٤٣- پێشکاری (بـ) لە زمانی نووسیندا، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (١٣٨)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٤٤- ڕێژەی کاری تێپەڕ لە شرۆڤەکاریدا ، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٣٢)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٤٥- دوو جێناوی لکاو بە بەراورد (-یەت) و (-ێت)، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٤٣)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٤٦- مۆرفیمی ئێستایی بە ئاوێتەیی، گۆڤاری (نەوشەفەق)، ژمارە (٦٢)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٤٧- زمانی کوردی زمانێکی بکەرلەپێش، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٥٠)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٤٨- زمانی کوردی زمانێکی بکەربەزێن، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٥١)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٤٩- زمانی کوردی زمانێکی ئەرکگۆڕ، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٥٢)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٥٠- زمانی کوردی زمانێکی نووسەکی، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٥٣)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٥١- زمانی کوردی و جێگۆڕکێی جێناو، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٥٤)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٥٢- نیشانەی کۆ (ان) تایبەتمەندی خۆی هەیە، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٥٥)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٥٣- جێناوی کەسی سێیەم توخمی دوور و نزیك هەڵ دەگرێت، زنجیرە زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٥٧)هەولێر ٢٠٠٨.

١٥٤- جێناوی کەسی سێیەم وەك باتلۆیەکی ڕێزمانی، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٥٨)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٥٥- ئامرازی گەیەنەر لە سەر ئامرازی نیشانە ڕۆنراوە، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٥٩)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٥٦- ئامرازی ناسراوی (ەکە) دیوی کۆی هەیە، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٦٠)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٥٧- دیاردەی ئەرکگۆڕکێی جێناو، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٦١)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٥٨- بووژاندنەوەی دەنگی خپی (ت)، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٦٣)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٥٩- بووژاندنەوەی دەنگی خپی (ر)، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٦٤)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٦٠- سێتە جێناوی بارگاوی (م، یت، ـە، ین، ن، ن)، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٦٧)،هەولێر ٢٠٠٨.

١٦١- نیشانەی نەرێ (نی)، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٧٠)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٦٢- ریزە جێناوی (م، ت، ی، مان، تان، یان) بارگاوین بە بەرکارێکی نادیار، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٧٤)، هەولێر ٢٠٠٨.

١٦٣- سرکایەتی لە روخساری رستەدا، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٧٨)، هەولێر٢٠٠٩.

١٦٤- کێشەی نیشانەی رابردوو (ت)، زنجیرەی زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردکاریدا، گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، ژمارە (٤٥٠)، هەولێر٢٠٠٩.

١٦٥- ئامرازی پەیوەندی (ە) لە چەند ئاڵۆزییەکی ڕێزمانیدا، گۆڤاری (پەروەردەو فێرکردن)، ژمارە (٢)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٦٦- کاری بوونی ئێستایی لە پەرێزی رستەسازیدا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٣٦)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٦٧- پانۆرامایەك بۆ ڕێزمانی ئاوەڵناو لە ئاخاوتنی کوردیدا، گۆڤاری (ك ٢١ )، ژمارە (٤)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٦٨- پانۆرامایەك بۆ واتاکانی کاری (دان) لە ئاخاوتنی کوردیدا، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٤٥)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٦٩- ئامرازی پەیوەندی (ـە) لە ڕێزمانی کاری ناسادەدا، گۆڤاری (زمانناسی)، ژمارە (١)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٧٠- چەند پەراوێزێك لە تەرازووی زمانی نووسیندا، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٤٦)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٧١- ڕێزمانی ئاوەڵناو بە بەراورد، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٣٨)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٧٢- دیوە تیۆرییەکانی فۆنیم و بڕگەی دەنگسازی لە ئاخاوتنی کوردیدا، گۆڤاری (زمانناسی)، ژمارە (٢)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٧٣- نیشانەی نەرێ (نی) لە شرۆڤەکاریدا، گۆڤاری (پەروەردە و فێرکردن)، ژمارە (٣)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٧٤- دیوە تیۆرییەکانی گرێی دەنگسازی بڕگەی ئاخاوتنی کوردی بە نموونە، گۆڤاری (زمانناسی)، ژمارە (٣)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٧٥- ڕێزمانی کاری لێکدراو بە کۆڵکەی بەرکار، گۆڤاری (ك ٢١)، ژمارە (٥-٦)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٧٦- جیاوازی نێوان ئامرازی کار و ئامرازی ئاوەڵگوزارە، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٤٧)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٧٧- شێوازەی کاری ئاسادە، گۆڤاری (زمانناسی)، ژمارە (٤-٥)، هەولێر ٢٠٠٩

١٧٨- ڕێزمانی بکەر و بەرکار لە تەرازووی ڕێزمانی کاردا، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٤٠)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٧٩- چەند بابەتێکی ڕێزمانی بە بەراورد، گۆڤاری (پەروەردە و فێر کردن)، ژمارە (٤)، هەولێر ٢٠٠٩.

١٨٠- ئامرازی (ـە) لە بەر زوومی پرسیاردا، گۆڤاری (زمانناسی)، ژمارە (٦)، هەولێر ٢٠١٠.

١٨١- ئاستەکانی جیاوازی لە نێوان ڕێزمانی کاری دارێژراو و کاری لێکدراودا، گۆڤاری (ك ٢١)، ژمارە (٧) هەولێر ٢٠١٠.

١٨٢- تیۆری سەرتاسەری ڕوخساری فۆنیم لە ئاخاوتنی کوردییەوە، گۆڤاری (زانکۆ پرێس)، ژمارە (١٠)، هەولێر ٢٠١١.

١٨٣- تیۆری سەرتاسەری گرێی دەنگسازی لە ئاخاوتنی کوردییەوە، گۆڤاری (زانکۆ پرێس)، ژمارە (١١)، هەولێر ٢٠١١.

١٨٤- تیۆری سەرتاسەری بنیادی بڕگەی ئاسایی، گۆڤاری (زانکۆ پرێس)، ژمارە (١٢)، هەولێر ٢٠١٢.

١٨٥- تیۆری سەرتاسەری بنیادی بڕگەی لێکدراو، گۆڤاری (زانکۆ پرێس)، ژمارە (١٣)، هەولێر ٢٠١٢.

١٨٦- تیۆری سەرتاسەری بنیادی بڕگەی ناتەواو، گۆڤاری (زانکۆ پرێس)، ژمارە (١٤)، هەولێر ٢٠١٢.

١٨٧- تیۆری سەرتاسەری بنیادی بڕگەی، گۆڤاری (زانکۆ پرێس)، ژمارە (١٥)، هەولێر ٢٠١٣.

١٨٨- تیۆری توانستی بزوێن، گۆڤاری (زانکۆ پرێس)، ژمارە (١٦)، هەولێر ٢٠١٣.

١٨٩ – کتێبی تەمەن (Vowel Power Theory)، گۆڤاری (زانکۆ پرێس)، ژمارە (١٨)، هەولێر ٢٠١٣.

## لیستی توێژینەوەکان لە بواری ئەندازیاری میکانیکدا

**لە وڵاتانی (فەرەنسا، کەنەدا، یابان، هۆڵەندا، چیک، هندستان، ئوردن، ناوخۆ)**

**یەکەم، بە زمانی ئنگلیزی:**

**1. Study of Hard Faced Steels under Thermal and Tribological Strains, Application to Copper- rolling. 4th CONTIROD conference, Ozaka, Japon 1984.**
**2. Surface Morphology and Contact Nature in Abrasion Processes, Journal of College of Education, University of Salaheddin, vol. 4, 1994.**
**3. Effect of Low Values of Surface Roughness in Abrasive Wear Mechanism, ZANKO, Journal of University of Salaheddin, vol. 6, No 2, 1994.**
**4. Effect of the Flank Wear Land on Cutting Edge Angles in Turning, ZANKO, Journal of University of Salaheddin, vol. 16, No 2, 2004..**
**5. The Theretical Approach for the Shape and Area of the Flank Wear Damage in Turning. 1st Middle East Conference on Advances in Civil, Mechanical and Material Engineering. Amman- Jordan, 10-13 May 2005.**
**6. A Reconsideration for the Position of the Cutting Edge in Turning, ZANKO, Journal of University of Salaheddin, vol. 16, No 5, 2005.**

7. Response Surface Regression Methodology. Evaluating in Turning 1050 Steel and Sardened Steel, ZANKO, Journal of University of Salaheddin, vol. 17, No 1, 2005.
8. Effect of the Contact Angle between the Cutting Edge and Surface of Cut on the Flank Wear Width in Turning Operations, ZANKO, Journal of University of Salaheddin, vol. 17, No 1, 2005.
9. The Study of Vibration Characteristics in Head Stock of a Lathe Machine at Different Cutting Conditions, ZANKO, Journal of University of Sulaimany, vol. 9, No 1, 2006..
10. Effect of the Tool Nose Radius of Coated Carbides on Surface Roughness in Turning, ZANKO, Journal of University of Slaimany, vol.1 9, No 1, 2007.
11. Improvement in Surface Roughness Quality of Aluminium by the Application of Roll-burnishing, ZANKO, Journal of University of Salaheddin, vol. 19, No 2, 2007.
12. Analytical Aspect of Some Ignorted Parameters Affecting the Flank Wear Land Width in Turning Operations, ZANKO, Journal of University of Salaheddin, vol.19, No 3, 2007.
13. The Impact of the Flank Wear Land VB on the Dimensional Deviation of Machined Parts. ZANKO, Journal of University of Salaheddin, vol. 19, No 4, 2007.
14. Optimum Cutting Conditions and Tool Life for Finish Hard Turning of AISI 1050 steel, ZANKO, Journal of University of Salaheddin, vol. 21, No 4, 2009.
15. Effect of a Higher Solution Annealing Temperature on the Abrasion Resistance of Duplex Stainless Steel SAF 2304, Journal of (Stainless Steel World), volume 22, May 2010.
16. Evaluation of the Abrasive Wear and Surface Roughness of Duplex Stainless Steel SAE 2304. Journal of (Stainless Steel World), published in Vol. (3), September 2010.
17. Determination of the Height of the Cutting Edge Lost in Wear from the Flank Wear Land VB in Turning Operations. Vol. 3 No. 3 September 2010, (Global Journal of Engineering and Technology).
18. Effect of Conic Head Angle on the Mechanical Properties of Friction Welded Joints of Al Alloy 6063. Vol. 3 No. 4 December 2010, (Global Journal of Engineering and Technology),
19. Effect of Steel Fiber Srengthening on the Mechanical Properties of Friction Welded Joints of Al Alloy 6063. Vol. 3 No. 4 March 2011, (Global Journal of Engineering and Technology).
20. Effect of Welding Temperature on the Hardness and Microstructure of Friction Weld Joints of Aluminum Alloy 6063, published in 5th International Mechanical Engineering Forum, Prague, June 20-22 2012.

**دووەم: بە زمانی فەرەنسی:**

1. Etude de la resistance a lendommagement des galets de laminoire a chaud., Revue de metallurgie, No 9 80e annee, Paris Septembre 1983.
2. Importance de phenomenes eletrochimique dans lendommagement dun acier peu allie, Proceeding of 9th International Congress on Metallic Corrosion, Toraonto Canada, June 3-7-1984 pp 171- 176.
3. Etude de lendommagement sous sollicitation multiple de super alliage Recharges. Proceeding of 7th International Conference on the Strength of Metals and Alloys, Montréal- Canada 12-16 August 1985 pp 1569-1574
4. Etude de levolution micro-structural dun alliage base Cobalt sollicite en cyclage terminus. SFM - Fatigue a haute temperature, Paris, Jun. 1986.

**سێیەم: بە زمانی عەرەبی:**

١- (تطوير سبائك الالمنيوم المستخدمة في تصنيع مكوك الغزل في مكائن الغزل والنسيج) مجلة زانكو المجلد (٥) العدد (٢)، اربيل ١٩٩٤
٢- (دراسة تأثير الاجهاد المسبق علي مقاومة التآكل الميكانيكي لصلب منخفض الكاربون) مؤتمر جامعة تكريت، ١٩٩٢.
٣- (مدي استخدام رمل ارضمة في تهيئة قوالب السباكة بواسطة ماكنة الرج والعصر)، مؤتمر جامعة صلاح الدين، اربيل ١٩٩٣)

**چوارەم: بە زمانی كوردی:**

١. پیشەسازی ئەلیكترۆنی و دروست كردنی توێژاڵی سیلیكۆن, گۆڤاری ( ئەندازیار), ژمارە (٢,٣), هەولێر ٢٠٠٢.
٢. پیسبوونی ژینگە بە دووكەڵی ئۆتۆمۆبیل, گۆڤاری ( ئەندازیار), ژمارە (٤), هەولێر, ٢٠٠٣.
٣. باری ئەندازیاری لە سیستەمی لێخوڕینی ئۆتۆمۆبیلدا, گۆڤاری ( ئەندازیار), ژمارە (٥,٦), هەولێر ٢٠٠٤.
٤. سیستەمی ئەی بی ئێس لە برێكی ئۆتۆمۆبیلدا, گۆڤاری ( ئەندازیار), ژمارە (٧,٨), هەولێر ٢٠٠٥
٥. ســـــیرامـــك, گۆڤاری ( ئەندازیار), ژمارە (١٠), هەولێر ٢٠٠٦
٦. گەشتێك بەناو كەرەستە تیژبڕەكاندا, گۆڤاری ( ئەندازیار), ژمارە (١١,١٢), هەولێر ٢٠٠٧
٧. هاوكێشەیەك بۆ لێكدانی گشت ژمارەكان, گۆڤاری زانكۆ پرێس, ژمارە (٦), هەولێر ٢٠١٠
٨. خشتەیەك بۆ لێكدانی گشت ژمارەكان, گۆڤاری زانكۆ پرێس, ژمارە (٧), هەولێر ٢٠١١.

## هەڵسەنگاندن

به ناوی خوای پەخشندە و میهرەبان

ئێمە قوتابیانی خولی یەکەمی زمان/ بەشی زمانی کوردی ساڵی خوێندن (١٩٩٥-١٩٩٦). لە کۆرسی خوێندندا بابەتی سینتاکسمان خویند (لە هەردوو کۆرسدا)، ئەم بابەتە لە لایەن (دکتۆر شێرکۆ بابان)ەوە ئامادە کرابوو, هەر خۆیشی دەی گوتەوە. ئێمەیش وەك قوتابیانی دکتۆرا بیر و رای خۆمان, لەم یارەیەوە, بەم شێوەیەی خوارەوە دەخەینە روو:

١- بابەتەکەی سینتاکسی (د. شێرکۆ) زۆر نوێیە و دوورە لە رێبازی لێکۆڵینەوەی لاسایی رێزمانە کۆنەکان, هەر لەبەر ئەوە بابەتێکی زۆر سوودبەخش بوو بۆ ئێمە.

٢- بۆ یەکەم جارە کە لێکۆڵینەوەی زمان تێکهەڵکێش بکرێت لە گەڵ بیرکاری و کۆمپیوتەردا, بە شێوەیەکی زانستی و پراکتیکی.

٣- ئەو بابەتەی کە خوێندمان لەوانەیە بچێتە نێو هەندێك لە نامەکانی دکتۆرا بە تایبەتی لە بواری لێکۆڵینەوەی مۆرفۆلۆژی و سینتاکسدا.

٤- ئێمە وەك قوتابیانی دکتۆرای زمان پێشنیار دەکەین کە ئەو بابەتە لە داهاتوودا لە پلەی ماجستێر و دکتۆرادا بخوێنرێت، لە بەر ئەوەی مێشکی قوتابیان دەکاتەوە بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی، دەربارەی زمان.

فەتاح مامە عەلی  تالیب خوسێن عەلی  یوسف شەریف

تارا عەبدولاَ  فەریدوون عەبدوول بەرزنجی

هەولێر ١ /١١/ ١٩٩٧

MINARA PRINING PRESS
چاپخانەی منارە - هەولێر
0750 445 6297